

# گۆڤاری کۆمپیوتەر

ژمارە ٥

(تشرینی یەکەم) ی ٢٠٠٥

گۆڤارێکی مانگانەی تایبەتە بەبواری کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت ـ وەزارەتی ڕۆشنبیری دەری دەکات

www.compmagz.com














- ڕیپۆرتاژێك سەبارەت بە بەکارهێنانی کۆمپیوتەر و ئینتەرنێت بۆ نابینایان .
- بەرنامەی فێربوونی زمانی ئینگلیزی بۆ منداڵان .
- بەکارهێنانی فلتەری ( Extract ) لەبەرنامەی فۆتۆشۆپ .
- بەکار هێنانی یاری کۆمپیوتەر بۆ مەشقی سەربازی .
- کاریگەری ڤایرۆس لەسەر سیستەم و بەرنامەکانی کۆمپیوتەر .



پاشکۆی گۆڤار : سی دی تایبەت بە گۆڤارەکە

هەولێر ـ ٢٠٠٥

# هەبوونی بازرگانی ئەلکترۆنی تا چ ڕادەیەك پێویستە

## سەرنووسەر

ئێمەی مرۆڤـ کاتێك کە پێویستیەکی ژیانمان هەبێت یان ئاواتێکمان هەبێت بۆ وەدەست هێنانی ئەو پێویستیە یان بۆگەیشتن بەو ئاواتە ئەبێت خۆمان ماندوو بکەین ،یان کار بۆ ئەوە بکەین کە پێویستیەکەمان جیٚ بە جیٚ بکەین یان ئاواتەکەمان بێنینەدی.بەلاٚم ئەوەی جێگای خۆشحاڵیە ئێستا زۆر شت گۆڕانکاری بەسەر داهاتووە و لەگەڵ پێشکەوتنی زانست و تەکنەلۆژیایی نوێی کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت ئێمە ڕۆژانە هەواڵی سەیرو دڵخۆشکەر دەبیستین،ئێستا لەهەموو جیهاندا کاری بازرگانی ئەلکترۆنی بۆتە پیشەی زۆر کەس و زۆر لە کۆمپانیا زەبەلاحەکان پەنا دەبەنە بەر ئەو شێوە بازرگانیە نویٚ یە و بەباشی لە قەڵەم دەدەن،بۆ نمونە ڕۆژانە هەزاران سەوداو کڕین و فرۆشتن لەو سایتە بازرگانیە ئەلکترۆنیانەدا دەکرێن کە کاری ئەو سایتانە تەنها بۆ بازرگانیە بە هەموو شێوازەکانی ، وەکوو بازرگانی ئۆتۆمبێل و بازرگانی خانو بەرە و بازرگانی کوتاڵ و بازرگانی شت و مەك و هەموو جۆرە کانی تری بازرگانی ، ڕەنگە لەلای خوێنەر سەیر بێت کە باسی ئەو هەموو بازرگانیە دەکەین ولەوانەیە بڵێن باشەئەو بازرگانیە چۆن لەڕێگای کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێتەوە دەکرێت ، لەکاتێك دا کە ئەو کەسە هەر لەماڵی خۆیدایە ،ئێمەش دەڵێین خوێنەری خۆشەویست لەلات سەیر نەبێت ڕەنگە لەماوەیەکی نزیکدا ئێوەی بەڕێزیش لە هەموو شارەکانی هەرێمی کوردستان ئەم بازرگانیە هەر لەماڵەکانی خۆتان بکەن و لەسەر ئامێری کۆمپیوتەرەکانتان و بەهۆیی ئەنتەرنێتەوە بتوانن چی پێویستیتان هەبێت بیکڕن بۆ خۆتان و ئەم کارەش زۆر ئاسانە ، تەنها ئەوەیە کە ئەبێت ناونیشانی ئەوسایتە بازرگانیانە بزانیت ئنجا ناونیشانی ئەو سایتە بازرگا نیە دەکەیتەوە و هەر لەماڵی خۆت و لەسەر کۆمپیوتەری خۆت دەبینی چی تۆ دەتەوێت بیکڕیت لەناو ئەو سایتە دا خراوەتە ڕوو بە شێوەی نووسین بێت یان بە شێوەی وێنە هەروە ها ئاماژە کراوە بە نرخەکەی ، ئنجا هەیە شتی بەکار هاتوو لە سایتەکان ئەخەنە بەر چاوو کە بێگومان ئەوان هەرزانترن لە نرخ ، بۆیە کە ئێوە ئەو شتانەی کە دەبینن لە سایتەکە ئەگەر مەبەستان کڕینی بێت ئەوا یان پۆستێکی ئەلکترۆنیان بۆ دەکەن( ئیمیل ) یان تەلەفۆنیان بۆ دەکەن ئەگەر ناونیشانی تەلەفۆن خرابووە بەر چاوبۆ مەبەستی کرینی ئەو شتە ئەوانیش ناو نیشانت لیٚ وەر ئەگرن و شتەکەت بۆ ڕەوانە دەکەن. بەم شێوەیە دەتوانن شت و مەك لە سایتە بازرگانیە ئەلکترۆنیەکاندا بکڕن و بۆ هەمان مەبەستیش دەتوانن خۆتان لە ماڵەوە بازرگانی بکەن بە کڕین و فرۆشتنی ئەو کەل و پەلانەی کەلەم سایتانەدا خراوەتە بەر چاو.

گۆڤاری
# کۆمپیوتەر

ژمارە ( 5 )
تشرینی یەکەم
2005

گۆڤارێکی مانگانەی تایبەتە بە بواری کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت . وەزارەتی رۆشنبیری دەری دەکات



## تێبینی : هەموو پەیوەندیەکان لە ڕێگای سەرنووسەرەوە دەبێت

ناونیشان :
هەرێمی کوردستانی عێراق / هەولێر . دیوانی وەزارەتی رۆشنبیری . شەقامی شەست مەتری نزیک هۆلی زەرد
بۆ هەر پێشنیار و تێبینی و سەرنجێک یان ناردنی بابەتێک . پەیوەندی بکەن بە سەرنووسەرەوە
بەم ناونیشانە : دیوانی وەزارەتی رۆشنبیری . بەڕێوبەرایەتی کۆمپیوتەر . یان بە ژمارە تەلەفۆنی
2232721 مۆبایل 07504618045 یان پۆستی ئەلکترۆنی



Email : computer_magazine_2005@yahoo.com
Email : aras_co_center@yahoo.com





ئاگاداری
بۆ هەموو ئەو بەڕێزانەی کە بابەت ئەنێرن بۆ بڵاو کردنەوە لە گۆڤارەکەمان با بە تەواوی ئاماژە بکەن بە ناونیشان و سەرچاوەی ئەو بابەتەی کە دەینێرن بە پێچەوانەوە ئێمە بەرپرسیار نین لە هیچ لێپرسینەوەیەك.











## بەرنامە 3



## زانیاری 30











## ڕیپۆرتاژ 41



## ئەنتەرنێت 44



## هەمەڕەنگ 53

# فێربوونی زمانی ئینگلیزی بۆ منداڵان

ئامادەکردنی: باوکی عەلی




وێنەی (١)

ئەم بەرنامەیە زۆر سادە و ساکارە بەڵام لە رووی فێرکردن زۆر بەهێزە بۆ منداڵان، بە تایبەتی پۆلی پێنجەمی سەرەتایی، ئەم بەرنامەیە لە هەشت بەش پێک دێت:

١. ناسینی پیتەکانە بە هۆی کیبۆرد و خوێندنەوەیان.
٢. فێربوونی خوێندنەوە و نووسینی رەنگەکان.
٣. ناسینی شێوەی پیتە گەورەکان.
٤. ناسینی پیتی گەورە و بچوکەکان بەیەکەوە.
٥. نووسینی پیتە بچوکەکان.
٦. نووسینی پیتە گەورەکان .
٧. خوێندنەوەی پیتە بچوکەکان.
٨. خوێندنەوەی پیتە گەورەکان .

# بەرنامەی فۆتۆ ئیفێکت photo effect

ئا: کاوە سلێمان




وێنەی ژمارە (١)




وێنەی ژمارە (٢)

ئـەو بەرنامەیـە وێنـە دەگۆڕێـت بـۆ چەند شـێوەیەک واتا رەنگی وێنەکە زۆر بەجوانی دەگۆڕێت هەندێ جار کەوێنەکە دەگۆڕێـت واهەسـت دەکەین ئـەو وێنە زۆرکونـە یاخـود وێنەکـە پایزییـە ئەم بەرنامەیەش کارکردنی زۆرسادەیە پاش دابەزاندنـی بەرنامەکـە لەسـەر ئامێری کۆمپیوتەر بەرنامەکە دەکەینەوە لەرێگای FILE لەوێـوەش OPEN دەتوانیـن هـەر وێنەیەک بمانەوێ بێنینـە ناو بەرنامەکە بە شـێوەی وێنە (١) پاشـان لەسەرەوە لـەلای چـەپ FILTERS نوسـراوە کاتی بەمـاوس کلیکی لەسـەردەکەین دەبینین چەند نوسراوێک دێتەبەرچاو کەهەریەک لەم نوسراوانە وێنەکە بۆجۆرێک دەگۆرن بۆنمونـە بێیـن SKETCH لەوێـوەش SHADE لێدەین دەبینین وێنەکەی گۆری بەجۆرێک کەسـەیر دەکەیـن وادەزانین وێنەکە بە پێنوس دروسـتکراوە سەیری وێنەدوو بکە.

# بەرنامەیەک بۆ گۆرینی ناوی (START)

ستافی گۆڤار

بـۆ زیاتـر جـوان کردنـی روکاری شاشەی کۆمپیوتەرەکەت و جوان بوون و دلگیربونـی کۆمپیوتەرەکـەت چەندان بەرنامـەی جـۆراو جـۆر هـەن، یەکێک لـەم بەرنامانـە گۆرینی نـاوی (START) بەهەرناوێکی تر .

بەرنامـەی (STARTBTN RENAMER) دەتوانێت بەخێراترین و کورترین هەنگاو ناوی سـتارت بگۆریت بۆ هەرناوێکی تر کە دەتەوێت لەدوای کردنەوەی بەرنامەکە ئەونـاوە دەنوسـین کە مەبەسـتمانە لە خانەی (NEW LABEL) دوایی کلیک لە سەر (IT RENAME) دەکەین یەکسەر ناوەکەی دەگۆرێت بروانە وێنەی ژمارە (١) دوایی سـەیری نـاوی سـتارت بکـە دەبینێـت گۆراوە بۆ ئەوناوەی کە نوسیوتە بروانە وێنەی ژمارە (٢).




وێنەی (١)

وێنەی (٢)

# زنجیرە (٤) بۆ فێربوونی پرۆگرامی ئەکسێس ٢٠٠٣

ئامادەکردنی: ڕێبوار نوری سعید

## دروست کردنی خشتە:

ڕێگای دووەم: دروست کردنی خشتەک بە ڕێگای DATASHEET VIEW

بۆ دروست کردنی خشتە بە ڕێگای DATASHEET VIEW:

١-یەک کلیک بکە لەسەر بەندی TABLES بکەو ئنجا یەک کلیک لەسەر دوگمەی NEW لە چوارچێوەی بنکەی زانیاری دوای ئەوە خانەیNEW TABLE دێتە سەر شاشە.

٢- یەک کلیک لەسەر جۆری DATASHEET VIEW بکە ئنجا یەک کلیک لەسەر دوگمەی OK.

دوای ئەوە خشتەیەک بە شێوازی خشتەی DATASHEET VIEW دێتە سەر شاشە کە ئامادیە بۆ نووسینی زانیاریەکان ئنجا دەست بکە بە نووسینی داتای تۆمارێک لە خشتەی پەرتووکەکان، بەم شێوەیەی خوارەوە:

١- بۆ گۆرینی ناوی کێلگەکان نیشانەی ماوس ببە سەر ناوی ستوونەکان شێوەکەی ئەگۆری بۆ ئاراستەیەک بۆ خوارەوە، ئنجا یەک کلیک بکە لەسەر ستوونەکە بۆ هەڵبژاردنی ئنجا یەک کلیکی لای ڕاست بکە لەسەری لیستی کورتکراوەی کۆماندەکان دەردەکەوێت، بۆ گۆرینی ناوی ستوونەکان یەک کلیک بکە لەسەر RENAME COLUMN. دوای ئەوە نیشانەی نووسین لە ناونیشانی ستوونەکە دەرکەوێت، ئنجا دەست بکە بە گۆرینی ناوی ستوونەکە بۆ ئەوە ناوەی کە ئەتەوێت و دوگمەی ENTER دابگرە.

دوای ئەوە ناوی هەموو کێلگەکان بە هەمان شێوە بگۆرە وەک ئەوەی لای خوارەوەی لێ بێت.

٢- بۆ کۆگەکردنی خشتەکە لیستیFILE بکەوەو یەک کلیک بکە لەسەر کۆماندی SAVE. دوای ئەوە خانەیەک دێتە سەرشاشە داوای نووسینی ناوێک بۆخشتەکە ئەکات، ناوی بنێ TBLBOOKS2 ئنجا یەک کلیک بکە لەسەر دوگمەی OK.

دوای ئەوە، نامەیەکی ئاگادارکردنەوە دێت کە تۆ کلیلی سەرەتایت بۆ خشتەکە دانەناوە وە پرسیارت لێدەکات کە ئایا ئەتەوێت ئێستا یەک لەکێلگەکان بکەیت بە کلیلی سەرەتایی بۆ خشتەکەت، ئەگەر ویستیت YES هەڵبژێرە ئەگەر نەتویست NO هەڵبژێرە. لێرەدا ئەمانەوێ کلیلێکی سەرەتایی بۆ خشتەکەمان دابنێین بۆ ئەم مەبەستەش یەک کلیک بکە لەسەر دوگمەی YES، دوای ئەوە پرۆگرامی ئەکسێس خۆی کێلگەیەک دروست دەکات و جۆری داتای AUTONUMBER ی بۆ دادەنێت و ئەی کات بە کلیلی خشتەکە.

ڕێگای سێیەم: دروست کردنی خشتەک بە ڕێگای هێنانی خشتە IMPORT TABLE

ئەم ڕێگایە بەکاردێت بۆ هێنانی خشتەیەک بە داتاکەیەوە لە بنکەیەکی زانیاری دەرەکی کە پێشتر دروستکرابێت هەروەک کۆپی کردنی خشتەکە وایە، بەپێی ئەم هەنگاوانە:

١- بۆ ئەم مەبەستە بنکەیەکی زانیاری نوێ بکەوەو ناوی بنێ BOOK3، ئنجا یەک کلیک بکە لەسەر TABLES ئنجا کلیک بکە لەسەر NEW لە شریتی ئامرازەکانی بنکەی زانیاری، دوای ئەوە خانەی NEW TABLE دێتە سەر شاشە.

٢- یەک کلیک لەسەر IMPORT TABLE بکە بۆ هەڵبژاردنی ڕێگەی هێنانی خشتەو ئنجا کلیک بکە لەسەر دوگمەی OK دوای ئەوە خانەی IMPORT هێنانی خشتە دێتە سەر شاشە کە لەشێوەدا لە خانەی OPEN دەچێت.




٣- یەک کلیک بکە لەسەر ناوی بنکەی زانیاری مەبەست (BOOKS) کە ئەتەوێت خشتەیەک یان زیاتری لێ وەربگریت، ئنجا کلیک بکە لەسەر دوگمەی IMPORT دوای ئەوە چوارچێوەی پێکهاتەی بنکەی زانیاریە دەرەکیەکەت بۆ دێتە سەر شاشە.




٤- یەک کلیک لەسەر TABLES بکە بۆ پیشاندانی ناوی خشتەکان، ئنجا یەک کلیک لەسەر ناوی خشتەی مەبەست (TBLBOOKS) بۆ هەڵبژاردنی ئنجا کلیک بکە لەسەر دوگمەی OK دوای ئەوە پرۆگرامی ئەکسێس خۆی دەست ئەکات بە هێنانی خشتەکەو داتاکەی بۆناو بنکەی زانیاری خۆت وە هەمان ناوی ئەداتی کە پێشتر لەبنکە زانیاریە دەرەکیەکە هەیبوو.




ڕێگای چوارەم: دروست کردنی خشتەک بە ڕێگای بەستنەوەی خشتە LINK TABLE

ئەم ڕێگایە بەکاردێت بۆ دروست کردنی خشتەیەکی بەستراوە بە خشتەیەک لە بنکەیەکی زانیاری دەرەکی کە داتاکەی تیا کۆگەکراوە بەپێی ئەم هەنگاوانە:

١- بنکەیەکی زانیاری نوێ بکەوەو ناوی بنێ BOOK4، دوای ئەوە یەک کلیک بکە لەسەر TABLES ئنجا کلیک بکە لەسەر NEW لە شریتی ئامرازەکانی بنکەی زانیاری، دوای ئەوە خانەی NEW TABLE دێتە سەر شاشە.

٢- یەک کلیک بکە لەسەر LINK TABLE بۆ هەڵبژاردنی ئنجا کلیک بکە لەسەر دوگمەی OK دوای ئەوە خانەی LINK TABLE دێتە سەر شاشە کە لە شێوەدا لە خانەی IMPORT دەچێت.




٣- یەک کلیک بکە لەسەر ناوی بنکەی زانیاری مەبەست (BOOKS) کە ئەتەوێت بە خشتەیەک یان زیاتری ببەستیتەوەبەبنکەی زانیاری خۆت، ئنجا کلیک بکە لەسەر دوگمەی LINK دوای ئەوە چوارچێوەی پێکهاتەی بنکەی زانیاریە دەرەکیەکە (BOOKS) بۆت دێتە سەر شاشە.





٥- یەک کلیک بکە لەسەر TABLES بۆ پیشاندانی ناوی خشتەکان، وە بۆ هەڵبژاردنی خشتەکە یەک کلیک بکە لەسەر خشتەی (TBLBOOKS) بۆ هەڵبژاردنی ئنجا کلیک بکە لەسەر دوگمەی OK دوای ئەوە پرۆگرامی ئەکسێس خۆی دەست ئەکات بە بەستنەوەی خشتەکە بۆناو بنکەی زانیاری خۆت، بۆ ئەمەش خشتەیەکی بەستراو بە هەمان ناوی خشتەکە دروست ئەکات وە لە تەنیشتیەوە ئاراستەیەک هەیە کە ئاماژە بەوە دەکات کە بەستراوەیە بە خشتەیەکی دەرەکی و داتا لە خشتە دەرەکیەکە کۆگە دەکرێت.

## کۆمەڵێک سایت بۆ دابەزاندنی بەرنامەکانی کۆمپیوتەر بەخۆرایی

/http://www.jumbo.com
/http://www.webdownloads.com
http://www.freegr.com/rank/index.html
http://www.1000freebies.com/list.html
/http://www.desktopfreebies.com
http://www.aplusart.com/index.html
/http://www.supershareware.com
/http://www.imarkup.com
http://computingcentral.msn.com/topics/bandwidth/speedtest50.asp
http://www.ulead.com/products/products.htm
http://www.turjuman.com/atranslate2.asp
/http://windowsupdate.microsoft.com
.http://www.khayma.com/masaher/programe
/http://www.bignosebird.com
http://www.reallybig.com/default.shtml
/http://www.graphxkingdom.com
/http://www.animfactory.net
http://javaarchives.javaarchives.com/java_
/http://www.1clipart.com
/http://www.fotosearch.ae
http://www.freewebspace.net/search/advanced.shtml
/http://www.harrythecat.com/graphics
http://www.clipart.com/index.html
/http://www.freegraphicland.com
/http://www.freestuffcenter.com
/http://www.luckysworld.com
/http://www.topfile.com/win/newapps
/http://www.webattack.com
http://cws.internet.com/new.html
http://www.wsabstract.com/cutpastejava.shtml
/http://www.perlarchive.com
/http://dynamicdrive.com
/http://groundlayerz.com
/http://www.freeware-downloads.com
/http://www.download.net

# بەرنامەی (MetaProducts Mass Downloader) بۆخێراکردنی داونلۆد

ئا: ڕێدار محمد

زۆرجـار ئێمـە کـە ( بەرنامەیەک یان گۆرانیـەک) لـە ئینتەرنێتـەوە داونلـۆد دەکەیـن لەوانەیە هەندێک جـار بەهۆی لەسـەرخۆ بوونـی خەتـی ئینتەرنێتەکە بۆداونلۆدکردن کاتێکی زۆر بخایەنێت بۆ ئەوەی رزگاربێت لەم کێشەیە پێویستیمان بـەم بەرنامەیە دەبێـت، بەکارهێنانی ئەم بەرنامەیە زۆر ئاسانە.

وە هـەروە هـا ئـەم بەرنامەیـە چەند بـە شـی هەیە بـۆ داونلۆدکـردن وە ک (OTHER COMPRESSED, PROGRAMS, MULTIMEDIA) وەک وێنەی ژمارە (١) .



وێنەی (١)

دوای ئەوەی کە بەرنامەکەمان لەسەر کومپیوتەرەکە دابەزاند ئینجا دەچین بۆ ئەو سـایتەی کە دەمانەوێت بەرنامە کە یا خود گۆرانیەکەی لێ داونلۆد دەکەین، ئینجا شـێوازی داونلۆد کردنەکە بە دوو ڕێگا دەبێت:

١- بـە کلیک کردن لەسـەر داونلۆدی ئـەو بەرنامەیـەی کەلـە سـایتەکە دایە ڕاسـتەوخۆ بەرنامـەی داونلۆدەکـە دەکرێتەوە پـاش ئەوەی کـە بەرنامەکە کەوتەسـەر شاشـە کە لە وێنەی ژمارە (٢) دیـارە کە بۆکسـی (GETTING FILE INFORMATION) دیـار دەکەوێـت چەند ساتێک دەوەستێت پاشان بۆکسێک بەدیار



وێنەی (٢)

دەکەوێت کە لەوێنەی ژمارە (٣) دا دیارە بۆئەوەی بزانیت بەرنامەکەت لە کامە هارد دادەنێیت و ئینجا کلیک لەسەر (SAVE) دەکەین دەست دەکات بە داونلۆد کردن وە ک وێنەی ژمارە (٤).......

٢- ئەگەر بەرنامەکە راستەوخۆ نەکرایە وە کلیکی لای راست لەسەر داونلۆدی بەر نامەکە دەکەین ئینجا کلیک لەسەر (MASS DOWNLOADER DOWNLOAD THIS FILE) دەکەین وەک وێنەی ژمارە (٥) . هەمان کاری خالی یەکەم دووبارەدەکەینەوە داونلۆدەکە دەست پێدەکات ..



وێنەی (٣)




وێنەی (٤)




وێنەی (٥)

# پوختە کردنی بەشێک لەوێنە بەبەکارهێنانی فلتەری (Extract) لەبەرنامەی فۆتۆشۆپ

ئامادەکردنی: عەزیز ئەسعەد

فلتەری (EXTRACT) بەیەکێک لەفلتەرە هەرە گرنگەکانی بەرنامەی فوتوشۆپ دەژمێردرێت، کاری ئەم فلتەرە بریتییە لەپوختەکردنی بەشێک لەوێنە کە مەبەستمانە و جیاکردنەوەی لەباگراوندی وێنەکە .

بۆ پوختەکردن و پاک کردنەوەی بەشێک لەوێنە پێویستە یەکەم جار بزانین کامە بەشمان لەوێنەکە دەوێ لای بدەین و کامە بەشمان دەوێ بیهێڵینەوە و ئەو بەشەی کە دەکەوێتە نێوان بەشەلادراوەکەو ئەو بەشەی کە ماوەتەوە کامەیە.

پێش هەموو شتێک ئەو وێنەیە دێنینە سەر ڕووبەری بەرنامەکە کە مەبەستمانە کاری لەسەر بکەین . پاشان دەچینە سەر




وێنەی (١)

لیستی ( FILTER ) و فەرمانی (EXTRACT) هەڵدەبژێرین وەک لەوێنەی ژمارە ( ١) .

ئەم فایل بۆکسەی خوارەوەمان بۆ دەکرێتەوە . وێنەی (٢) .

لەم فایل بۆکسە چەند فەرمانێک و ئامرازێکمان بۆ دیار دەکەوێت، لەسەرەتادا دەبێت ئامرازی (دیاری کردنی قەراغەکان (ڕۆخەکان) ( EDGE HIGHLIGHTER TOOL ) بەکاربێنین بۆ دیاری کردن و جیاکردنەوەی ئەو بەشە لەوێنە کە دەمانەوێ بمێنێتەوە لەگەڵ ئەو بەشەی کە دەمانەوێ لای بدەین .

بۆ ئەم مەبەستە پێنووسی دیاری




وێنەی (٢)

















وێنەی (٣)

کردنەکە هەڵدەبژێرین و بەسەر ئەو قەراغە ( ڕۆخ ) ە دا دەیبەین کە دەکەوێتە نێوان باگڕاوند و ئەو بەشەی کە مەبەستمانە جیای بکەینەوە .

دەبینین ئەو هێڵەی کە دروست دەبێت ڕەنگێکی سەوز بەخۆوە دەگرێ و دەتوانین ئەستوری و باریکی هێڵە کە بگۆڕین بە گۆڕینی ژمارەی ( BRUSH SIZE ) . هێڵەکە تەواو دەکەین لەچوار دەورەی بەشی مەبەست بۆ پوختەکردن، بەمەرجێک ئەبێ سەرەتاو کۆتایی هێڵەکە بەیەک بگەیەنینەوە . وێنەی ژمارە (٤).

(دەتوانین ئامرازی ڕەش کەرەوە (الممحاه ) بەکاربێنین بۆ سڕینەوەی هێڵەکە یان بەشێکی، ئەگەر هاتوو هەڵەمان کردن لەدروست کردنی هێڵەکە).

دوای ئەوە ئامرازی (پڕکەرەوە) (FILL TOOL ) هەڵدەبژێرین وە لەسەر ئەو شوێنە کلیک دەکەین کە مەبەستمانە




وێنەی (٤)




وێنەی (٦)

وێنەی (٥)



وێنەی (٧)

پوختــەو جیــای بکەینــەوە . بەمەش ئەم بەشــە پڕ دەبێتــەوە بەڕەنگێکی شــین . لەگــەڵ ڕەچاوکردنــی ئەوەی کــە ڕەنگە شینەکە هەموو شوێنەکەی پڕ کردۆتەوە. وێنەی ژمارە ( ٥ )

بۆ ئەم مەبەســتەش دەتوانین ئامرازی گەورەکــردن و بچوک کــردن ( ZOOM ) بەکار بهێنین بۆ گەورەکردنی وێنەکە بۆ ئەوەی هەموو بەشەکان بەباشی ببینین.

دوای ئــەوە کلیــک لەســەر فەرمانــی (PREVIEW ) دەکەیــن، بــەم شــێوەیە دەتوانین ئەو بەشە ببینین کە پوختەکراوە لەوێنەکە . وێنەی ژمارە ( ٦ )

ئەگــەر هاتــوو چــوار دەوری بەشــە جیاکراوەکــە جــوان دەرنەکەوتبوو یان لەکەو پیسی پێوە بوو، ئەو کاتە دەتوانین ئامرازی پاک کەرەو ە(CLEANUP) بەکار بێنین بۆ لابردنی ئەو ماک و پیسیانەی کە وێنەکە دەشــێوێنن وە بە داگرتنی کلیلی (ALT) لەگەڵی ئەوا دەتوانین ئەو شوێنانە بگەڕێنینەوە کە کە پێویست ناکات ڕەش بکرێنــەوە. وە ئامــرازی چاکردنــەوەی قەراغەکان(EDGE TOUCHUP) بەکاردێنین بۆ گەرانەوەی ئەو شوێنانەی کە لەبەشە پوخــت کراوەکــە خــوراوە تاکو بەشــە جیاکراوەکــە بەشــێوەیەکی ڕێک و پێک دەردەکەوێ .

دوای ئــەوەی کە دەگەینــە ئەنجامیکی باوەڕپێکراو کلیک لەســەر ( OK ) دەکەین . بــەم شــێوەیە توانیمــان پوختــەی ئەو وێنەیەمان دەست بکەوێ کەمەبەستمانە جیــای بکەینــەوە لەوێنــە ســەرەکیەکە . وێنەی ژمارە (٧)




# بەرنامەی Jaws to PDF Creator

ئا: ئەژی عەزیز

ئەم بەرنامەیە بۆ گۆرینی فایلاتی نووسین یان وێنە بۆ PDF. ئەمەش لە کاتی چاپ کردنی نووسینەکە یان هەرشتی تر، ئەم جۆرە فایلاتانەمان دەست دەکەویت
لێرەدا دەبێ بزانین PDF چی یەو سودی چی یە؟ PDF بریتیە لە جۆرە فایلاتێک کە نووسین یان وێنەی تێدا هەڵدەگیرێت، واتە نوسینەکە دەکاتە شێوەی وێنە،کە شێوەو فۆنتەکەی بەجێگیری دەمێنێتەوە دەیپارێزێت.
ئەگەر سەیری ئینتەرنێت بکەین دەبینین زۆربەی کتێبەکان بە شێوەی فایلاتی PDF دەبینرێت، بۆیە بەڕای من ئەم جۆرە فایلاتانە زۆر بەسودن بۆ هەڵگرتنی کتێب لە ناوی دا وە هەروەها دەتوانین بە ئاسانی بیانخوێنینەوە،بەتایبەتی کتێبی کوردی کەلە ناو پەرەکانی ئینتەرنێت




وێنەی (٢)




وێنەی (١)

دا،بەبێ گۆڕانی فۆنتی کوردی!!
لێرەدا باسی بەرنامەی JAWS TO PDF CREATOR دەکەین وەکو نمونەیەک لەبەرنامەی مایکرۆسۆفت ۆرد:
پاش دامەزراندنی SETUPی بەرنامەکە، ئەم بەرنامەیە خۆی دەچێتە شوێنی چاپکردن، بە نمونە لێرە لە پەڕەیەکی ۆرد FILE پاشان PRINT دابگرە وەکو ئەم وێنەیە(٢) (٣):




وێنەی (٣)

# زنجیرە (٤) بۆ فێربوونی بەرنامەی میدیا ستۆدیۆ

## چۆنیەتی سکرین کردنی دوو پارچە ڤیدیۆ لەسەر یەکتر

ئا: فاخر مەحمود

سەرەتا لەرێگای VIDEO FILE وە هەردوو پارچە ڤیدیۆکان دینینە ناوبەرنامەکە بەلام ئەوڤیدیۆیەی دەتەوی سکرینی بکەی دەبیت لەبۆشای چوارەم بەرەوخوارەوەبیت لەبەرئەوەی بۆشایی سییەم و دوەم و یەکەم سکرینی لەسەر ئەنجام نادرێت . ئینجا بەلای راستی ماوسەکە کلیک لەسەر ڤیدیۆکە دەکەین بە شێوەی وێنە (١) دەبینین لیستێک دەبینێتەوە لەناوەراستی لیستەکە OVELAY OPTIONS نووسراوە کلیکی لەسەر



وێنەی (١)

دەکەین لیستێکەتر دەبێتەوە ئەم جارە لەم لیستە نوێیە لەلای راست TRANS PARENCY نووسراوە هەروەها بۆشاییەک کەژمارەی سفری تێدا نووسراوە و لەگەل گێجێک هەیە دەتوانی لەرێگای ژمارەکەوە سکرین ئەنجام بدەی واتا گۆرینە سفرەکە بۆ ژمارەی ٥٠ دەبینین کەزۆر بەجوانی ڤیدیۆکە سکرین بوە یاخود لەرێگای گیچەکەوە واتا بەماوس بیبەی بۆ لای راست دەبینیت کەڤیدیۆکە خۆی سکرین دەبیت بە شێوەی وێنە (٢) ئینجا OK دەکەیت



وێنەی (٢)

# GOLDEN EYE




## ستافی کۆڤار

ئەم بەرنامەیە بەکاردێت بۆ چاودێری کردنی کۆمپیوتەر بۆ ئەوەی بزانیت کەوا لە دوای تۆ کێ دەست کاری کۆمپیوتەری کردووە و چیان بەکارهێناوە، ئەم بەرنامەیە ئەو کارەی لەسەر کۆمپیوتەرەکەت ئەنجام دەدرێت پاش دەرچونی تۆ گشتی تۆماردەکات.

چۆنیەتی بەکارهێنانی: سەرەتا بەرنامەکە بکەرەوە و لە لاپەرەی GENERAL دەست بنی بە دووگمەی START MONITORING بۆ ئەوەی بەرنامەکە دەست بکات بە تۆمارکردن پاشان دووگمەی HIDE دابگرە بۆ ئەوەی بەرنامەکە وون بکات بۆ ئەوەی بە نهێنی کارەکان تۆماربکات، پاش ئەوەی ویستت بەرنامەکە رابگری و شتە تۆمارکراوەکان سەیر بکەیت ئەوە بۆ کردنەوەی بەرنامەکە SHIFT+CTRL+ALT+P دابگرە (ئەم SHORTCUT کورت کراوەیە خۆت دەتوانی بیگۆریت بۆ شتێکی تر ئەویش لە لاپەرەی OPTIONS سەیری وێنەی GOLDEN AAلە بەشی HOTKEY دەبێت، هەر لەم لاپەرەیە دەتوانیت PASS WORD ووشەی نهێنی بۆ بەرنامەکە دابنێی ئەوەش کەوا زۆر گرنگە بۆ ئەوەی لە کاتێکدا بەرنامەکە بزر دەکەیت بۆ ئەوەی شتەکان بە نهێنی تۆمار بکات ئەگەر یەکێک بزانیت بە SHIFT+CTRL+ALT+P دەکریتەوە ئەوە دەیکاتەوە بەلام ئەگەر ووشەی نهێنی دابنێیت ئەوا لە کاتی کردنەوەی داوای ووشەی نهێنی دەکات، بۆ ئەوەی سەیری تۆمارکراوەکان بکەیت، برۆ سەر لاپەرەی REPORT وێنەی GOLDEN ٢ لە سەر دووگمەی REFRESH کیک بکە بۆ ئەوەی تۆمارکراوەکان دابەزێنێتە ناو خانەی تایبەتی خۆی لە لاپەرەی REPORT، دەست بنی بە دووگمەی REPLAY SCREENSHOTS بەم شێوەیە تۆمارکراوەکان لە ویندۆیەکی تایبەتی دەکریتەوە کەوا دەتوانی وێنەکان فرمانی بدیتی لاپەرە لاپەرە خۆی بە شێوەیەکی ئۆتوماتیکی هەڵیان بداتەوە یان خۆت بە دەست لاپەرە لاپەرە هەڵیان بدەیتەوە.

دەتوانی دەستکاری بەرنامەکە بەو شێوەی خۆت مەبەستتە بۆ تۆمارکردن و بۆ نمونە وێنەکانی تۆماردەکات هەر ٢٠ چرکە یەک وێنە تۆمار بکات یان زیاتر بۆ وورد بوونەوە لە کاری تۆمار




کردن لە لاپەرەی MONITORING بەشی SCREENSHOTسەیری وێنەی GOLDEN BB بکە هەروەها بۆ روون کردنی وێنەی تۆمارکراو بەرێژەی ١٠٠٪ دەتوانی زیادی بکەیت، لە لاپەرەی MONITORING لەسەر هەموو CHECK BOX خانە چوار گۆشە بچوکەکان کلیک بکە بۆ ئەوەی هەموویان دەست نیشان بکەیت بۆ ئەوەی تۆمار کردن هەمووی بەرنامەیک بگرێتەوە بۆ نموونە ئەنتەرنێت و چات و فۆلدەر و .....

لە لاپەرەی ABOUT فەرمانی CHECK UPDATE تایبەتە بە نوێ کردنەوەی بەرنامەی GOLDEN EYE بە مەرجێک هێلی ئەنتەرنێت هەبێت،

هیوادارم سوودمەند بێت بۆ دام و دەزگا میریەکان و ئەهلییەکان و خاوەن پیشەکان.






# دروست کردنی ئەلبومی ئەلیکترۆنی بە بەرنامەی Apollo Photo2vcd

ستافی کۆڤار




وێنەی (١)

هەلگرتنی وینەو یادگاریەکان بۆ ماوەیەکی زۆر بەبێ تیکچون و سەلامەتی پاراستنیان ئەرکێکە مروڤ هەولّی بۆ دەدات لەسەر ئەم بنچینەیە چەندان بەرنامەی جوراو جۆر دروست کراوەن بەرنامەی APOLLO PHOTO2VCD یەکێکە لە بەرنامە تازەکان و بەرنامەیەکی زۆر سەرکەوتوە بۆ دروستکردنی ئەلبومی ئەلیکترونی و خستنە سەر سیدی .

بە هوی ئەم بەرنامەیەوە دەتوانین ئەلبومیکی ئەلیکترۆنی دروست بکەین و بەئاسانترین شیوە وە هەرکاتیک مەبەستت بیت دەتوانیت بە ڤیدو سیدی ئەم ئەلبومە نمایش بکەیت و سەیری وینەکان بکەیت بەبێ ئەوەی لە پیس بون و دران و لە ناوچونیان بترسییت.

کارکردن لەم بەرنامەیە زۆر ئاسانە دوای دامەزراندنی بەرنامەکە راستەوخۆ وینەکان دادەبەزینیە ناو بەرنامەکە وەکو لەوینەوی ژمارە (١) دیارە دواتر لە بەشی ژیرەوەی بەرنامەکە خیرایی

گۆڕینی وێنەکان و خێرایی بەدوایەک هاتنیان دیاری دەکەین، یەکێک لە تایبەتمەندیەکانی ئەم بەرنامەیە ئەوەیە ئەگەر کارەکەمان تەواو نەبوو ئەوا دەتوانین سەیڤ بکەین تا ئەو کاتەی کارەکانی تەواو دەکەین، ئینجا دەیخەینە سەر شێوەی ڤیدیۆیی لەگەڵ ئەمەشدا دەتوانین گۆرانی یان مۆسیقا لەگەڵ نمایش کردنی وێنەکان گوێ لێبگرین ئەویش بە کلیک کردن لەسەر (EDIT) هەڵبژاردنی EDIT BACKGROUND MUSIC ئینجا بۆکسێک دەکرێتەوە لەوێ گۆرانیەک یان پارچە مۆسیقایەک هەڵدەبژێرین




وێنەی (٢)

وێنەی (٣)

وێنەی (٤)

بڕوانە وێنەی ژمارە (٣) . کرداری خستنە سەر ڤیدیۆ دوای تەواوبون و دانانی تەواوی وێنەکان کلیک لەسەر ئەو نیشانەیە دەکەین کە لەوێنەی ژمارە (١) ئاماژەی پێکراوە بۆکسێک دەکرێتەوە بڕوانە وێنەی ژمارە (٤) لەوی (VCD) هەڵدەبژێرین دوایی (PAL) هەڵدەبژێرین و شوێنی فایلەکە دیاری دەکەین و کلیک دەکەین لەسەر (NEXT) دەکەین ئینجا بۆکسێکی تر دێت کلیک لەسەر (FINISH) دەکەین دواتر وەک لە وێنەی ژمارە (٥) دیارە کردارەکە کۆتایی دێت و ئەبێت بەخاوەنی ئەلبومێکی ئەلیکترۆنی .



وێنەی (٥)

# بەرنامەی ejay چیەو چۆن بەرکار دەهێنرێت

ئا: هاوکار رەحمان




وینەی (١)

زۆربەی ئەو کەسانەی کەکاری دەنگی دەکەن وە ئەندازیارەکانی دەنگی بەشێک لەئەندازەی دەنگی پێی دەڵێن EJAY ئەویش کە گۆڕینی کورانیە لەئەندازەی خۆی بۆ ئەندازەیەکی ڕۆمانتیکی کە لەم سەردەمەدا باوە . وەچۆنیەتی




وینەی (٢)

بەکارهێنانی بەم شێوەیە دەبێت:

ئەو ژمارانەی کەنوسراوە وە ١ ٢ ٣ ٤ هتد ئەوا شوێنی تراکی گۆرانیە کەلەخانەکانیدا بنێین وێنەی( ٢)
لەلای دەستە ڕاستەوە دەبینین کە هێمای (-LOOP-BASS- VOLCE EFFECT-SYNINT-DRUM- (SEQUENCE- SPECLAL-AEP WAEV وە ئەو هێمایانەی کە هەیە هەر یەکەو چەند دەنگێکی تیدایە کە حازرکرایە بۆ کاری EJAY
ئەگەر بمانەوێ گۆرانیەک دروست بکەیین یەکەیەکە لەم دەنگەکان دادەنێین لە ناو خانەکانی ١ و٢ وە٣ وەتاکو بەخۆمان بمانەوێ، وێنەی (٣)
دەبینین کە گۆرانیەک دروست دەبی زۆر بەڕێکی وەک وێنەی (٤)
وە PLAY دەکەین تاکو بزانین چۆن گۆرانیەک دروست بووە وێنەی (٥)
وە ئەگەر بمانەوێ خەزنی بکەین دەچینە سەر EXPORT کلیک دەکەین ئەو شوێنەی کەبمانەوێ خەزنی بەکەین وەک وێنەی (٦).




وێنەی (٣)




وێنەی (٤)



وێنەی (٥)



وێنەی (٦)

# دەرهێنانی ئەنجام و بڕیار (قرار) لەئێکسڵ

زانکۆ ئەسعد تەها
zanco2005@gmail.com

لەژمارەکانی پێشوتردا باسی یەکێک لە نەخشەکانی بەرنامەی ئێکسڵ مان کرد کە ئەویش نەخشەی (VLOOKUP) بوو،لە ژمارەی ئەمجارەدا باس لە بەکارهێنانی نەخشەیەکی تر دەکەین ئەویش نەخشەی (IF) کە لەراستی دا ئەم نەخشەیە گرنگەیەکی تایبەتی خۆی هەیە بۆ زۆر مەبەستی جیاواز بەکاردەهێنرێت،لێرەدا ئێمە دوو بەکارهێنانی ئەم نەخشەیە روون دەکەینەوە یەکێکیان بو دەرهێنانی ئەنجام بەشێوەی (دەرچوو،کەوتوو) بۆ کۆمەلە ناوێک کە هەریەکیان نمرەیەکی هەیە ئەوی تریان بۆ گۆرینی نمرەکان بۆ (٥٠) بۆ ئەو کەسانەی کە نمرەکەیان لە نێوان (٤٥) تاوەکو (٤٩) دایە وەکو بڕیاری پێنج نمرە (قرار)،سەرەتا باسی گۆرینی نمرەکان بۆ (٥٠) و دواتر چۆنیەتی دەرهێنانی ئەنجام دەکەین هەنگاوەکانیش ئەمانەن:

١.کلیک لەسەر (START) دەکەین پاشان دەچینە سەر (PROGRAMS) دواتر کلیک لەسەر (MICROSOFT EXCEL) دەکەین، بڕوانە وێنەی (١).




وێنەی (١)

٢.پاش چوونە ناو پرۆگرامی ئێکسڵ وە گۆرینی ئاراستەی شیت بۆ لای دەستە راست ئەویش بە کلیک کردن لەسەر (SHEET RIGHT-TO-LEFT) ئەوا ستونێک ناو دەنێین (ناو) کۆمەلە ناوێک لە ژێری دا تومار دەکەین وە ستونێکی تر ناو دەنێین (نمرە) کۆمەلە ژمارەیەک وەکو نمرەی کەسەکان تومار دەکەین لێرەدا من هەردوو ستونی (A,B) هەلبژاردووە،بڕوانە وێنەی (٢).

| ناو | نمرە |
|---|---|
| ئارام | 70 |
| توانا | 45 |
| دانا | 65 |
| دەشتی | 80 |
| ڕووداو | 90 |
| ڕێبین | 40 |
| زانکۆ | 47 |
| لانە | 80 |
| هەوژێن | 49 |

وێنەی (٢)

٣.دوو کولومی تر یەکیان ناو دەنێین (بڕیاری پێنج نمرە) وە ئەوەی تریان ناو دەنێین (ئەنجام) و من هەردوو ستونی (C,D) بەو ناوانە ناو ناوە وەک وێنەی (٣).

| ناو | نمرە | بڕیاری پێنج نمرە | ئەنجام |
|---|---|---|---|
| ئارام | 70 | | |
| توانا | 45 | | |
| دانا | 65 | | |
| دەشتی | 80 | | |
| ڕووداو | 90 | | |
| ڕێبین | 40 | | |
| زانکۆ | 47 | | |
| لانە | 80 | | |
| هەوژێن | 49 | | |

وێنەی (٣)

٤.کلیک لە سەر خانەی ژێر ستونی (بڕیاری پێنج نمرە) دەکەین پاشان لەلیستی (INSERT) دا کلیک لەسەر (FUNCTION) دەکەین وە لەشوێنی (SEARCH FOR FUNCTION) دەنووسین (IF) پاشان کلیک لەسەر (GO) ئینجا دواتر لەسەر(OK) دەکەین بڕوانە وێنەی (٤).

وێنەی (٢)

٥. لـە بۆکسـی نەخشـەی (IF) دا خانـەکان بـەم شـێوەیە پردەکەینەوە :

* خانەی (LOGICAL_TEST) تایبەتە بە مەرج لێرەدا دەنووسین (AND) دواتـر کەوانەیـەک دەکەینـەوە لەنـاوی دەنووسـین (B2>=٤٥،B2<=٥٠) ولێـرەدا(B2) ناوی خانەی نمرەی یەکەم کـەس بەگوێرەی ئـەم نموونەیـەی ئێمە،لە راسـتی دا (AND) یش نەخشـەیەکە کـە بەکاردێت بۆ بیکەوە بەسـتنی هەردوو مەرجەکە ئەویش ئەویە دەبێت کە نمرەکە لە نێوان(٤٥) تاوەکو (٤٩) دابێت .

* لەخانـەی (VALUE_IF_TRUE) دا دەنووسـین (٥٠) واتـە ئەگەر ئەو مەرجەی سەروە دروست بوو ئەو نمرەکە بکات بە (٥٠)،وە لـە(VALUE_IF_FALSE) دا ناوی خانەی نمرەی یەکەم کەس دەنووسـین بەگوێرەی ئەم نموونەیەی ئێمە دەکاتە (B2) واتە ئەگەر مەرجەکە دروسـت نەبوو ئەوە نمرەکە وەک خۆی بێت،دواتر کلیک لەسەر(OK) دەکەین بڕوانە وێنەی (٥).

وێنەی (٥)

٦.پاش دەرهێنانی ئەنجامی خانەی یەکەم ئەوا ماوسەکەت ببە سەر لێواری ژێرەوەی لای دەستە چەپی خانەی یەکەم کاتێک تیرەی ماوەس شـێوەی (+) وەرگرت رای کێشـە بۆ خوارەوە بۆ دەرهێنانـی ئەنجامی خانەکانی تر، دەبینت ئەو خانانەی کە نمرەکانیان لە نێوان (٤٥) تاکو (٤٩) دایە نمرەکەیان بوتە پەنجا وە ئەوانی تر وەک خۆیەتی،بڕوانە وێنەی (٦).

وێنەی (٦)

٧.بۆ دەرهێنانی ئەنجام ئەوا کلیک لەسەر خانەی ژێر (ئەنجام) دەکەین لەلیستی (INSERT) دا کلیک لەسەر (FUNCTION) پاشان کلیک لەسەر فانکشنی (IF) دەکەین.

٨.لەخانـەی (LOGICAL_TEST) دا دەنووسـین (C2>=٥٠) لێـرەدا (C2) نـاوی یەکـەم خانـەی (بڕیـاری پێنج نمـرە) یە بەگوێرەی ئـەم نموونەیە،وە لەخانـەی (VALUE_IF_TRUE) دا دەنووسین (دەرچوو) واتە ئەگەر مەرجەکەی سەرەوە کە هەر نمرەیەک گەورەتر یان یەکسان بوو بە پەنجا دروست بوو ئەوا بەرامبـەری بنووسـرێت دەرچوو،وە لـە (VALUE_IF_FALSE) دەنووسین (کەوتوو) واتە ئەگەر مەرجەکە دروست نەبوو ئەوا بەرامبەری نمرەکە بنووسرێت کەوتوو،بڕوانە وێنەی (٧).

وێنەی (٧)

٩. پاش دەرهێنانی ئەنجامی خانەی یەکەم ئەوا ماوسەکەت ببە سەر لێواری ژێرەوەی لای دەستە چەپی خانەی یەکەمی ئەنجام کاتێک تیرەی ماوەس شێوەی (+) وەرگرت رای کێشە بۆ خوارەوە بۆ دەرهێنانی ئەنجامی خانەکانی تر، دەبینت ئەو خانانەی کە نمرەکانیان لە (٥٠) بەرەو سەرەوە ئەوا لە بەرامبەری نوسراوە دەرچوو بەڵام ئەو خانانەی کە نمرەکەیان(٥٠) کەمترە نوسراوە کەوتوو،بڕوانە ئەنجامی کۆتایی وێنەی (٨).

تێبینی:ئەوخانەنەی کە لێرەدا ئاماژیان بۆ کراوە بەگوێرەی ئەم نموونەیە بۆ لەوانیە لە نموونەیکی تر جیابێت لەبەر ئەوە پێویستە ناوی یەکەم خانەکانی (بڕیار و ئەنجام) بزانیت کە دەتەوێت ئەم کردارانەیان بەسەر جێ بەجێ بکەیت،وە ئاگاداری ئەوبە کە لەکاتی نوسینی مەرجەکە پێویستە سەرەتا هێمای گەورەتر یان بچوکتر دواتر هێمای یەکسانە دابنرێت واتە بەم شێوەیە (>=,<=) بێت.

Microsoft Excel - Book13

D2 $f_x$ =IF(C2>=50 "کەوتوو","دەرچوو")

| | A | B | C | D | E | F | G |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 1 | ناو | نمرە | بڕیاری پێنج نمرە | ئەنجام | | | |
| 2 | ئارام | 70 | 70 | دەرچوو | | | |
| 3 | توانا | 45 | 50 | دەرچوو | | | |
| 4 | دانا | 44 | 44 | کەوتوو | | | |
| 5 | دەشتی | 80 | 80 | دەرچوو | | | |
| 6 | رووناک | 90 | 90 | دەرچوو | | | |
| 7 | رێبین | 40 | 40 | کەوتوو | | | |
| 8 | زانکۆ | 47 | 50 | دەرچوو | | | |
| 9 | لانە | 80 | 80 | دەرچوو | | | |
| 10 | هەوراز | 49 | 50 | دەرچوو | | | |

Sheet3 Sheet2 Sheet1

Ready

# Google & yahoo قەبارەی گەڕانی خۆیان ڕادەگەیەنن

ئا: دیار عزیز

لە نوێترین ڕکابەری دا هەردوو گەورە کۆمپانیا لەبواری گەڕان لە ئەنتەرنێت (GOOGLE و YAHOO) ژمارەی ئەو فایل و بەڵگەنامایەیان ئاشکرا کرد کە لەلایەن خۆیان تۆماریان کردووە بەمەبەستی گەڕان لە ئەنتەرنێت، کۆمپانیای (GOOGLE) لەلایەن خۆیەوە ژمارەی فایلەکانی بە (٨،١) ملیار فایل خەملاند و لەبەرامبەردا کۆمپانیای (YAHOO) ئەو ژمارەی بەرز کردەوە (١٩،٢) ملیار فایل کە ئەمەش وایکرد کاردانەوەی لەلایەن (GOOGLE) لێ بکەوێتەوە بەجۆرێک لەسەر زاری (سێرجی برین) کە یەکێکە لەدامەزرێنەرانی کۆمپانیاکە ڕاگەیەنرا: ئەوان پێیان وایە ئەو ژمارە زۆرەی (YAHOO) لەوانەیە لەئەنجامی چەسپ کردنی فایلەکانی بەشێوەیەکی دوولایەنە و دووبارە بووەوە بێت کە ئەمەش وادەکات قەبارەی فایلەکان زۆرو کاراییەکەی کەم بێتەوە، بەهەمان شێوە (برین) ڕایگەیاند: قەبارەی هەر سایتێکی گەڕان پێوانە دەکرێت بەژمارەی ئەو لاپەڕانەی کە سایتەکە دەتوانێت بیانخاتە ڕوو لە لاپەڕەکانی وێب بەبێ دووبارە بوونەوە وە دوو پاتیشی کردەوە کە ئەوان لەسەر ئەم بنەمایە قەبارەی گەڕانی خۆیان خەملاندووە، لەلایەن خۆیەوە (YAHOO)




پێداگری لەسەر ڕاستی ژمارەی فایلەکانی کرد و ڕایگەیاند کە ئەوان شانازی دەکەن بەوەی کە زاناو ئەندازیارەکانیان بەدەستیان هێناوە و بەردەوامیش دەبن لەپێناو پڕکردنەوەی پێداویستی بەکارهێنەرانی سایتەکە بە پێشکەش کردنی باشترین پسپۆڕێتی لەبواری گەڕان لەسەرانسەری جیهان، لەلایەکی ترەوە چاودێران گومانی خۆیان دەربڕی لەقەبارەی گەڕانی(YAHOO) و ڕایانگەیاند کە ئەم ڕاگەیاندنەی کۆمپانیاکە لەگەڵ جۆری ئەو ئەنجامانە یەک ناگرێتەوە کە سایتەکە دەیانخاتە ڕوو وە پێیان وایە ڕاگەیاندنی قەبارەی گەڕان لەلایەن دوو کۆمپانیاکە ڕکابەری سیاسی و بازرگانی لەپشتە .

بەهەمان شێوە توێژەران لە(بنکەی نێودەوڵەتی بۆ ڕاهێنانی کۆمپیوتەر) هەڵسان بەتاقیکردنەوەیەک لەسەر گەڕانی هەریەک لە GOOGLE & YAHOO کە پێکهاتبوو لە (١٠،٠١٢) پرسیاری هەرەمەکی بۆیان دەرکەوت ئەنجامەکانی (GOOGLE) لەنیوەی پرسیار و حاڵەتەکان بەڕێژەی ١٦٦،٣٪ لە (YAHOO) زیاترە، وەبەپێچەوانەوە ئەنجامەکانی (YAHOO) بەڕێژەی ٣٪ لە (GOOGLE) زیاترە کە ئەمەش وایکرد توێژەران گومانی خۆیان بەرامبەر ڕاگەیاندنەکەی (YAHOO) دەربڕن.

سەرچاوە :

سایتی (الموسوعة العربية للكومبيوتر والانترنيت)

# پێناسەیەکی بەشەکانی بەرنامەی Flash Mx

ئامادەکردنی: فەیسەڵ مەعروف

هەر لەگەڵ پەرەسەندن و بلاوبوونەوەی ئەنتەرنێت پێویستیەکی زور بەوە بووە کەوا بەرنامەیەک هەبێت پالپشتی ئەنتەرنێت بکات بە دیزاینی پەرەکانی توری جالجوکەیی لە ریگای زمانی HTML لەگەڵ پێشکەوتنی زانست چەندین زمانی تر دەرکەوتن کە بوونە یارمەتی دەر لە پێشخستنی دیزاینی لاپەرەکان لە هەموو بوار و ئاستێکدا.
بەرنامەی فلاش بەم دواییە بلاوبوتەوە، وە بوەتە پێکهاتەیەکی بنچینەیی لاپەرەکان، بویە سەرنجی زور لە کومپانیا بە کار هێنەرانی کومپیوتەری راکێشاوە.
پاش دابەزاندنی بەرنامەی فلاش بو سەر سیستەمەکەت و کردنەوەی بەرنامەی FLASH MX شاشەی سەرەکی بەرنامە کە پێک هاتووە لە چەند پەنجەرە یەک، لەخوارەوەباسیان دەکەین، وێنەی (١).



وێنەی (١)

یەکەم: شریتی ئەدوات:
ئەم شریتە لە کومەڵێک ئایکون پێک هاتووە (وێنەی ٢)، کە بریتن لە مانەی خوارەوە:
١. دیاری کردن ARROW: ئەم ئامرازە تایبەت بە دیاری کردنی شێوە کێشراوەکان لە شانوی کارکردن.




وێنەی (٢)

٢. دیاری کردنی پێکهاتەکان SUB SELECTION: تایبە بە دیاری کردنی پێکهاتەکانی شێوەکان بو نمونە پێکهاتەی چوار گوشە بریتی یە لەچوار خاڵ.
٣. هێل LINE: هەڵدەستێت بە وێنە کێشانی هێلێکی راست کە لە دوو خاڵ پێک دێت.
٤. دیاری کردنLASSO: تایبەتە بە دیاری کردنی ئالوزو بە گوێرەی ئارەزووی بە کارهێنەر.
٥. پێنووس PEN: بو وێنەکێشان بە کار دێت لە رێگای وێنەی کێشانی خاڵەکان، هەروەها تایبەتمەندە بە گورینی شێوەکان لە رێگای زیادکردن و سرینەوەی خاڵەکان بو نمونە چوار گوشە لە چوار خاڵ پێک دێت گەر هاتوو خاڵێکمان سریەوە ئەوا شێوەکەی دەبێتە سێگوشە.
٦. دەق نووسین TEXT: بو نووسین بەکار دێت.
٧. شێوەی بازنەیی و یا هێلکەیی OVAL: بو وێنە کێشانی بازنەیی و یا هێلکەیی بە کار دێت.
٨. ئامرازی لاکێشە RECTANGLE: بو وێنە کێشانی لاکێشە و چوارگوشە بەکاردێت وە بە گوێری ئارەزووی بەکارهێنەر.

٩. ئامرازی پینووسی رەساسی PENCIL بۆ وێنەکێشانی ئازاد.
١٠.فلچە BRUSH: بۆ پڕ کردنەوەی شێوە وێنە کێشراوەکانی بە رەنگەکان.
١١. ئامرازی گۆرینی شێوەکانFREE TRANSFORM : ئەم ئامرازە گۆرانکاری بە شێوەکان دەهێنێت بە دوو شێوە (گەورەکردنی شێوەکە SCALE،وەرگێرانی شێوە بە گۆرینی گۆشەکەی ROTATE٠
١٢. ئامرازی رەنگ کردنی گۆشەی دیاری کراو لە لایەن بەکار هێنەرFILL TRANSFORM0
١٣. ئامرازی دیاری تایبەتINK BOTTLE
١٤. ئامرازی رەنگ کردنی گشتی BUCKET TOOL
١٥. ئامرازی هەلگرتنی رەنگEYE DROPPER رەنگی دیاری کراو هەل دەگریت بۆ ئەوەی دواتر بەکار بهێنریت.
١٦. ئامرازی سرینەوە ERASER هەلدەستی بە سرینەوەی وێنەو رەنگەکان.
١٧. ئامرازی دەست HAND بۆ جوولە پی کردنی شانۆی کار بە دێت٠



وێنەی (٣)

١٨. ئامرازای گەورەکردن ZOOM بۆ گەورە کردنی شانۆ کردن و شیوەکان بە کاردێت.
١٩. ئامرازی رەنگ کردنی هێلەکان STROKE COLOR



وێنەی (٤)

٢٠. ئامرازی رەنگ کردنی ناوەوە FILL COLOR

دووەم: تابلوی دەست کاری رەنگەکان COLOR MIXER: بەکاردێت بۆ گۆرانکاری سەر رەنگی وێنەو شێوەکان، ئەویش دەبێتە دوو بەش یەکێکیان تایبەت بە رەنگی هیلی وێنە کەو دووەمیان هەلبژاردنی رەنگی شیوە کان وە یا بە دەر کەوتن و شاردنەوەی رەنگەکان وێنەی (٣)٠

سێیەم: چینەکانLAYER: چینەکان زۆر گرنگە و بنچینەی کار کردنە لە فلاش و لە چەند چوار چێوە یەک FRAME پێک هاتووە وێنەکانی تێدایە، وێنەی (٤)٠

چوارەم: شریتی چوار چێوەکان FRAME بۆ کات : بە شێوەیەکی ستاندەر لە ١٢ چوار چێوە پێک دێت هەر چوار چێوەیەک سانیەک، لە رێگای تەنسیقی جوولەی چوار چێوەکان و رێکخستنی فلیمی فلاش دەکرێت وێنەی (٥)٠



وێنەی (٥)

پێنجەم: تابلوی COMPONENTS: ئەویش ئەوکەرەستە سەرکیانە لە خۆ دەگرێت کە بە زۆری لە فلاش بە کار دەهێنرێن٠ وێنەی (٦)٠

شەشەم:تابلوی PROPERTIES: تایبەتمەندی فایلی فلاش و شێوەکان کونترول دەکات وێنەی (٧)٠

حەوتەم: تابلوی ئەکشن ACTIONS: بە کار دێت بۆزیاد کردنی فەرمانە بەرنامەییەکانی فلاش وێنەی (٨)٠



وێنەی (٧)



وێنەی (٦)



وێنەی (٨)

# ڤایرۆسی کۆمپیوتەر ئێستا بە ساناتر بڵاودەبنەوە لێی ئاگاداربن؟




وەرگێرانی لە عەرەبییەوە:
عامر

سەرەتا لە ڕووی زانستییەوە دەبێ بزانین ڤایرۆسی کۆمپیوتەر چییە؟ ڤایرۆسی کۆمپیوتەر، بریتییە لە پڕۆگرامێک کە نەخشیەکی بنەڕەتی بۆ کێشراوە، بە مەبەستی ئەوەی بتوانێ دەستبخاتە ناو کاروچالاکییەکانی کۆمپیوتەر بۆ (لەبەر گرتنەوە) واتە فۆتۆکۆپی یا(تێکدان) یا(سڕینەوەی) دەرخستە تۆمارکراوەکانی سەر کۆمپیوتەر، یاخۆ لەبەرگرتنەوە بە مەبەستی گواستنەوەی بۆ ئامێرەکانی تری کۆمپیوتەر یا کەناڵەکانی تری هێڵی ئەنتەرنێت، بۆیە زۆربەی جار ئەمەش دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی تواناو ئیشکردنی لەسەرەخۆی ئامێرەکە، وە پەیدابوونی گیروگرفتی تری هەمەجۆر.

مەترسی ڤایرۆسەکانی کۆمپیوتەر لەنێوان ئاستی مام ناوەندی و توند دایە لە تێکدان، کە بە شێوەو شێوازی نوێی هەمەجۆردا بە دیار دەکەوێ . بەڵام،لە ئاستێکی نزمی ئاگایی و زانین دایە، بۆیە ئەوانەی کە ئامێری کۆمپیوتەر بەکاردەهێنن دەتوانن خۆ لابدەن و نەبنە قوربانی ئەم ڤایرۆسانە .

بڵاوبوونەوەی ڤایرۆسی(کرم) سانایە بۆیە دەبێ لە نێوان فایلە پێک بەستراوەکان و هێڵەکانی تۆری ئەنتەرنێت بڵاودەبێتەوەو، قەبارەکەی نزیکەی ١٤ K.B/ە، بە شێوازێک پەستراوە : ئەویش بریتییە لە فایلێکی جێبەجێکەرلە(ویندۆز) کە لەگەڵ هاتنە ژوورەوەی بۆ ناو سیستەمی کۆمپیوتەر بەم شێوی لی دێت:

لە : "S V C N E T . E X E "

SYSTEM٪SVCNET.EXE٪

لە(رجیستر)خۆی تۆماردەکات بەم شێوەیە:

H K L M S O F T W A R E M I ]
C R O S O F T W I N D O W S
[C U R R E N T V E R S I O N R U N
H K C U S O F T W A R E M I ]
C R O S O F T W I N D O W S
[C U R R E N T V E R S I O N R U N
"SVCNET.EXE"="SHELLAPI٣٢"

پاشان دەست دەکات بە زیاد بوون و دروست کردنی چەندەها فایلی جۆراوجۆر، بەناوی پڕۆگرامە بەناوبانگ و ناسراوەکان وەک:

STUDIOS GAMESXCOPY 1.0.8 CRACK. 321 EXE
3D SLOT CAR RACING GAME 1.0.EXE
3D STUDIO MAX 6 CRACK.EXE
ABBY FINEREADER PRO 7.0 CRACK.EXE
ACDSEE 7.0.61 CRACK.EXE
ACDSEE POWERPACK 7.0.43 CRACK.EXE
ACDSEE V7.0 POWERPACK 7.0 CRACK. EXE
AD-AWARE PRO CRACK.EXE
AD-AWARE PROFESSIONAL.EXE
AD-AWARE.EXE
ADOBE ACROBAT READER CRACK.EXE
ADOBE ACROBAT READER.EXE
ADOBE AFTER EFFECTS PRO V6.5 CRACK.EXE
ADOBE GOLIVE V6.0 KEYGEN.EXE
ADOBE ILLUSTRATOR V10.0 TIME LIMIT CRACK.EXE
ADOBE IMAGEREADY V1.0 CRACK.EXE
ADOBE PAGEMAKER V7.0 KEYGEN.EXE
ADOBE PHOTOSHOP 7 KEYGEN.EXE
ADOBE PHOTOSHOP CS 8 CRACK .EXE
ADOBE PHOTOSHOP CS CRACK .EXE
ADOBE PHOTOSHOP UNIVERSAL CRACK .EXE
ADOBE SERIAL GENERATOR V2.0.EXE
ADULT TETRIS 2 CRACK .EXE
AGE OF EMPIRES II THE AGE OF KINGS NO CD CRACK.EXE
AGE OF MYTHOLOGY - THE TITANS NO CD CRACK.EXE
AGE OF MYTHOLOGY NO CD CRACK. EXE
AGNITUM OUTPOST FIREWALL 2.5.369 CRACK.EXE
AHEAD NERO BURNING 6.6.0.3 ULTRA EDITION KEYGEN .EXE
CLONECD 5.X CRACK.EXE
CLONECD ALL VERSION KEYGEN.EXE
CLONEDVD V1.X CRACK.EXE
CLONEDVD V3.X RETAIL CRACK.EXE
CLONEDVD2 V2.X CRACK.EXE
COMMAND & CONQUER - GENERALS NO CD CRACK.EXE

- MACROMEDIA FLASH 5 CRACK.EXE
- MACROMEDIA FLASH ALL VERSIONS KEYGEN.EXE
- MACROMEDIA FLASH MX V6.0 CRACK.EXE
- MACROMEDIA FLASH SWF-UNPROTECT V2.0.EXE
- MACROMEDIA FREEHAND V10 LOADER.EXE
- MICROSOFT OFFICE 2000 REGMAKER.EXE
- MICROSOFT OFFICE XP ACTIVATION CRACK.EXE
- MICROSOFT OFFICE XP ACTIVATION KILLER.EXE
- MICROSOFT OFFICE XP PROFESSIONAL CRACK.EXE
- MICROSOFT OFFICE XP PROFESSIONAL SERIAL.EXE
- MICROSOFT OFFICE XP UNIVERSAL ACTIVATOR V1.0.EXE
- MICROSOFT WINDOWS MEDIA PLAYER.EXE
- MICROSOFT WINDOWS XP PROFESIONAL SP 2 KEYGEN.EXE
- MSN MESSENGER (WINDOWS XP).EXE
- MSN TOOLBAR ADVERT REMOVER.EXE
- MSN TOOLBAR.EXE
- NERO 6 ULTRA EDITION 6.6.0.1 CRACK.EXE
- NERO 6 ULTRA EDITION CRACK.EXE
- NERO 6 ULTRA EDITION KEYGEN.EXE
- NERO 6 ULTRA EDITION.EXE
- NERO 6.6.0.1 CRACK.EXE
- NERO 6.6.0.3 ULTRA CRACK.EXE
- NERO BURNING ROM 6.6.0.3 CRACK.EXE
- NERO BURNING ROM RELOADED CRACK.EXE 6.6.0.1
- NORTON 2005 CRACK.EXE
- NORTON ANTISPAM 2004 CRACK .EXE25-01-2005
- NORTON ANTIVIRUS 2004 CRACK.EXE
- NORTON ANTIVIRUS 2004 PROFESSIONAL ACTIVATION KEYGEN .EXE
- NORTON ANTIVIRUS 2004 PROFESSIONAL EDITION KEYGEN .EXE
- NORTON ANTIVIRUS 2005 CRACK.EXE
- NORTON INTERNET SECURITY 2005 CRACK.EXE
- NORTON PERSONAL FIREWALL 2005 RETAIL CRACK.EXE
- WINAMP 5.03 FULL CRACK.EXE
- WINAMP FULL.EXE
- WINDOWS SERVER 2003 CRACK.EXE
- WINDOWS SERVER 2003 SP1 BUILD 1039-2L CRACK.EXE
- WINDOWS XP ACTIVATION CRACK.EXE
- WINDOWS XP HOME EDITION ACTIVATION.EXE
- WINDOWS XP PRO 64-BIT CRACK.EXE
- WINDOWS XP PROFESSIONAL CRACK.EXE
- WINDOWS XP SP2 KEYGEN.EXE
- WINDVD PLATINUM 5.0.26.23 CRACK.EXE
- WINMX.EXE
- WINRAR 3.30 CORPORATE ED CRACK.EXE
- WINRAR 3.X CRACK.EXE
- WINRAR ALL KEYGEN.EXE
- WINZIP 9.X CRACK.EXE
- WINZIP ALL KEYGEN.EXE
- WINZIP ALL VERSIONS KEYGEN.EXE
- WINZIP KEYGEN.EXE
- WINZIP SELF-EXTRACTOR V2.2 KEYGEN.EXE
- WINZIP SELF-EXTRACTOR V2.2 PATCH.EXE
- WINZIP V8.0 KEYGEN.EXE
- WINZIP V9.0 KEYGEN.EXE
- ZONE ALARM SECURITY SUITE 5.5.062 CRACK.EXE
- ZONEALARM CRACK (KEYGEN.EXE
- ZONEALARM.EXE

هەروەهــا تێبینــی هەنــدێ زاراوەی زیــاد دەکرێ، بۆ ســەر ناو ناونیشــانی پرۆگرامە ئاراســتەکراوەکان، ئەم جۆرە فایلانــەش کە ئێمە بــە دواییدا دەگەڕێین بە شێوەیەک بڵاوبوونەتەوە، خۆی زیاتر لە جێگاکانی (کراک) و (سریال)دا هەیە .

ئــەم ڤایرۆســەش هەڵدەســتێ بــە گۆڕینی ئاستی ئامادەیی پاراستنی خۆی بــۆ ئەوەی ڕێ پێــدراو بێت بــۆ ناردنی زانیارییــەکان بە شێوازێکی/ســیخوڕی/ یان "پاتش" بەمەش ئاســتی مەترسی بۆ ســەر کۆمپیوتەرەکە زیاتــر دەبێت. بۆیە جــۆری ڤایرۆســی"کرم" مەترســیدارەو بڵاوبوونەوەی سانایە .

الموقع الفرعی فی الحوار المتمدن:
مازن المنصور



# بەرنامەی RAM&HDD Cleaner

زۆرجار ئێمە لەکاتی کارکردنمان لەسەر ئامێری کۆمپیوتەر هێمای CLOSEدێتە سەرشاشە هەندێجار لاناچێت تائەوبەرنامەی کاری لەسەردەکەی داینەخەی وەهەندێجاریش هەرلاناچێت تا کۆمپیوتەرەکەمان پێ ڕیستارت دەکاتەوە ئەمەش دەبێتە گرفت لەبەردەمــان . لەم کاتە بەرنامەی (RAM&HDD CLEANER) ئەم گرفتەمان بۆچارەسەر دەکات.

پــاش دابەزادنی بەرنامەکە لەســەر ئامێری کۆمپیوتەر دێین بەرنامەکە دەکەینەوە لەلای ڕاست لەخوارەوە FAST CLAENING نوســراوە بەماوس یەکجار کلیکی لەســەردەکەین ڕاستەو خۆ ڕام و هاردمــان بۆخاوێن دەکاتــەوە بۆماوەی چەند دەقەیەک ئینجــا بەرنامەکــە دادەخەیــن لەوکاتەوە خــۆی ڕۆژانە لەگەڵ پێکردنی کۆمپیوتەر وەک ئەنتیڤایرۆس کاردەکات هەرگرفتێک هەبێت خۆی چارەی دەکات بێ ئەوەی ئێمە بیکەینەوە.

# کۆپی کردن لە ویندۆزی XP بە بێ بوونی بەرنامەی کۆپی

ئامادەکردنی: کامەران خۆشناو
kameran 7605@yahoo.com

یەکێک لە نوی کارییەکانی ویندۆزی XP ئەوەیە کە بۆ کوپی کردن لە هارددسک بو سەر CD پیویستی بەهیچ بەرنامەیەک نییە، بو نمونە تـو دەتەوێ چەند فایلیک بخەیتە سـەر CD. بۆ ئەنجـام دانی ئەم کارە ئـەم خالانـەی خـوارەوە جیبەجی بکە.




وینەی (١)

١- هەلسـە بـە دیـاری کردنـی ئـەو مەلەفانەی کـە ئەتەوێ کوپیـان بکەیت، بروانە ( وینەی ژمارە ١) .

٢- کلیکی راسـتی ماوس بکە لەسـەر یەکێـک لە مەلەفـەکان وە برۆ بو SEND TO وە پاشـان رایتەرەکـە دیـاری بکـە (وینەی ژمارە ٢) .

٣- پاشـان هەلدەستی بە کوپی کردنی کاتی بۆ سەر رایتەرەکە، هەتا ئەگەر CD بە تالیشی تیا نەبیت (وینەی ژمارە ٣) .

٤- CD یەکی بەتال بخە نیو رایتەرەکە، وە بـرو بـو MY COMPUTER، وە دوایی رایتەرەکـە بکـەرەوە، دەبینیـن مەلەفـە کاتیـەکان لەنـاو رایتەرەکـەن، وەکـو مەلەفە شـاردراوەکان دیارن، وە لەسەر ئایکونەکەیـان سـەهمیکی بچـوک هەیە وەکو ئەوەی شورت کەت کرابن (وینەی ژمارە ٤) .

٥- لـە پانـە لیسـتی لای چـەپ دەسـتەواژەی WRITE THESE FILES TO CD کلیـک دەکەیـن، وە شاشـەیەک دەکریتـەوە دەتوانی ناویـک لە CD یەکە بنیت (وینەی ژمارە ٥) .




وینەی (٢)

٦- دوایی کلیکی NEXT بکە، وە بەردەوام بە لەسەر کلیک کردنی ئەو شاشانەی کە دین، دوایی دەبینین کرداری نووسین لەسەر CD یە بەتالەکە دەست پیدەکات.

تیبینی: دەتوانین مەلەفی تریش زیاد بکەین بو سەر CD یەکە هەموو جاریک، تا ئەو کاتەی شوینی بەتال هەبیت لەسەر CDیەکە.



وینەی (٣)



وینەی (٤)



وینەی (٥)



# چارەسەری کێشەی shutdown لە XP دا

ئامادەکردنی: کەمال عەبدوڵلا حەسەن
kamal_kurdi@yahoo.com




وێنەی (١)




وێنەی (٢)




وێنەی (٣)

ئەگەر کومپیوتەرەکەت لە کاتی SHUTDOWN کردن کارەباکەی ناکوژێتەوە، لەوانەیە پێویستیت بەوە هەبێت کە لە ناو ریجیستریدا هەندێ گۆرانکاری دروست بکەی. (تەنانەت ئەگەر ڕێکخستنەکانی BIOS و POWER یش دروست بن، دیسان دەبێت ئەم هەنگاوانە جێ بە جێ بکەی بۆ چارە سەر کردنی :

١- بە ماوس کلیک لە سەر START بکە و لەوێش RUN هەڵبژێرە، وێنە(١).

٢-ئیجا لە پەنجەرەی RUN دا بنووسە REGEDIT وە OK دابگرە، وێنە (٢).

٣-ئینجا لە پەنجەرەی REGISTRYEDIT دا فایلی HKEY_CURRENT_USER هەڵبژێرە ودەبل کلیکی لە سەر بکە، وێنە (٣).

دوای ئەم کردارە پەنجەرەیەکت بۆ دەبێتەوە لە ناو پەنجەرەکە لە سەر CONTROL PANEL دووجار کلیک بکە،

وێنە (٤).

ئینجا پەنجەرەیەکی تر دێت لە ناو پەنجەرەکە لە سەر DESKTOP یەک جار کلیک بکە، وێنە (٥).

لەم پەنجەرەیەدا لە ناو زانیارییەکان فایلی POWEROFFACTIV دەست نیشان بکە ئینجا بە ماوس دەبل کلیکی لە سەر بکە، وێنە (٦).

پەنجەرەیەک وەک نموونەی وێنە (٧)، دێتە بەردەمت.

لە ناو شریتی سپی ژمارەی ١ بنووسە و OK دابگرە.

بەم جۆرە کێشەی SHUTDOWN لە سیستەمەکەت دا چارە سەر دەکرێت.




وێنەی (٤)




وێنەی (٥)




وێنەی (٧)




وێنەی (٦)

# دروستکردنی شێوەیەک لە ئایکۆنەکانی سیستەم


وینەی (١)

**ئامادەکردنی: زامدار ئەسعد**

دەتوانین هەستین بە دروستکردنی جیاوازی فولدەرەکانی سیستەم لەسەر دیسکتوب یاخود لە مینوی ستارت دا، ئەویش بەزانینی کودی شورکەتەکە، بو نموونە بو دروستکردنی ئایکونی کونترول پەنال لەسەر دیسکتوب ئەوا ئەم هەنگاوانە دەکەین: ١.کلیکی لای راست لەسەر دیسکتوب (NEW) پاشان (FOLDER) بکە وەک وینەی (١).

١.ناوی فولدەرەکە بەم کودەی خوارەوە ناوە دەنین
CONTROL PANEL.{21EC2020-3AEA-1069-A2DD-08002B30309D}


وینەی (٢)

کە دەبینت فولدەرەکە دەبیت بە ئایکونی (CONTROL PANEL) وەک ئایکونی کونترول پەنلی ناو مای کومپیوتەرە بروانە وینەی (٢)، دەبیت سەرەتا ناوی فولدەری سیستەم، پاشان دانانی خالیک ئینجا کودی فولدەرەکە بنووسیت، وەدەبیت یەکەم پیتی ووشەکان کەپیتەل بیت.

ئەمانەی خوارەوەش چەند کودیکن:

بو دروستکردنی ئایکونی کونترول پەنال
CONTROLPANEL.{21EC2020-3AEA-1069-A2DD-08002B30309D}

بو دروستکردنی ئایکونی (DIAL-UP NETWORKING)
DIAL-UPNETWORKING.{992CFFA0-F557-101A-88EC-00DD010CCC48}

بو دروستکردنی ئایکونی پرینتەر
PRINTERS.{2227A280-3AEA-1069-A2DE-08002B30309D}

بو دروستکردنی ئایکونی مای کومپیوتەر
MY COMPUTER.{20D04FE0-3AEA-1069-A2D8-08002B30309D}

بو دروستکردنی ئایکونی ریسایکل بین
RECYCLE BIN.{645FF040-5081-101B-9F08-00AA002F954E}

بو دروستکردنی ئایکونی نیتورک
NETWORK NEIGHBORHOOD.{208D2C60-3AEA-1069-A2D7-08002B30309D}

بو دروستکردنی ئایکونی مای دیکومینت
MY DOCUMENTS.{450D8FBA-AD25-11D0-98A8-0800361B1103}

بەم شیوەیە دەتوانین هەستین بە دروستکردنی هەر ئایکونیکی سیستەم ئەگەر رەش کرابیتەوە یاخود شاردرابیتەوە وە گواستنەوەی ئەم ئایکونە بو هەر شوینیک کە مەبەستمانە ئەویش بە زانینی کودی ئەو ئایکونە

# چێک کردنی فایلەکانی سیستەم (DLL files)

ئامادەکردنی:
ئیسماعیل عبدالله شێخانی

سیستەم فایل چێکەر (SFC) یەکێکە لە کوماندەکانی دۆسی ئێکسپی کە بەکاردێت بۆ چێک کردنی فایلە (DLL) کانی سیستەم واتە ئەگەر هاتوو هەر فایلێکی (DLL) ی سیستەم تەواو نەبوو یاخود نەمابوو لە سیستەمەکەت ئەوا بە بەکارهێنانی ئەم کوماندە دەتوانین ئەو فایلانە بگەڕێنینەوە،کوماندەکە بەم شێوەیەی خوارەوە بەکاردێت:

١. کلیک دەکەین لەسەر(START) وەپاشان(RUN).

٢. لەناو (RUN) دا دەنووسین (CMD) وەک وێنەی (١) .

٣. لە ناو کوماندی پرۆمپت دا دەنووسین، (SFC /SCANNOW) پاشان ئینتەر دەکەین وەک وێنەی (٢).

٤. پاشان داوای (CD) ی ویندۆز ئێکس پی مان لێ دەکات، وە سی دی ویندۆزەکە دەخینە ناوە سی دی ڕوم،پاشان هەلدەستێت بە کرداری چێکردنی فایلاتی سیستەم ئەگەر هەر هەڵەیەک هەبوو تێدا ئەوا چاکیان دەکاتەوە ئەمەش بەجێ گۆڕینی ئەو فایلانەی کە تێکچونە،وە پێویستە ئەمەش بزانین کە کرداری چێک کردنەکە نزیکەی (١٥) چرکە دەخایەنێت وەک وێنەی (٣).



وێنەی (١)



وێنەی (٢)



وێنەی (٣)

**تێبینی:**

١. ئاگاداری دانانی ئەو بۆشیە (SPACE) بیە کە لەدوای (SFC) دێت لە کاتی نووسینی (SFC /SCANNOW).

٢. بۆ وەرگرتنی زانیاری زیاتر دەربارەی ئەم کوماندە دەتوانێت لە ناو کوماند پرومپت دا (COMMAND PROMPT) بنووست (SFC /?) .

# شاردنەوەی کۆنترۆڵ پەناڵ

وێنەی (١)

ستافی گۆڤار

زۆربەی زانیاریە لەدەست چووەکان و تێکچونی سیستەمەکانی کۆمپیوتەرو سڕینەوەی فایلەکانی سیستەم و بەرنامەکان لە ڕێگای کۆنترۆل پەنەل دەبێت و بەدەستی ئەو کەسانە دەبێت کە شارەزایەکی ئەوتۆیان نیە لە کۆمپیوتەر، جا بۆئەوەی لەم کێشە چاوەڕوان کراوەدا دەرباز بین پێویستە ئاسانترین ڕێگە بگرینە بەر ئەویش بریتیە لە شاردنەوەی کۆنترۆل پەنال لە تەواوی سیستەمەکەدا.

بۆ بەجێگەیاندنی ئەم کارەش لە سەرەتا دا دەچینە سەر (START) دوایی کلیک دەکەین لەسەر (RUN) ئینجا (GPEDIT. MSC) دەنوسین دوایی کلیک لەسەر (OK) دەکەین بڕوانە وێنەی ژمارە (١) دواتر



وێنەی (٢)

چاوەڕێ دەکەین تا ئەم چوارگۆشەیە دەردەکەوێت کە لەوێنەی ژمارە (٢) کەبریتیە لە (GROUP POLICY) دا دیارە ئینجا کلیک لەسەر (ADMINISTRATIVE TEMPLATES) دوایی راستەوخۆ دوو کلیک لەسەر کۆنترۆل پەنال دەکەین چوارگۆشەیەکی تر دەکرێتەوە بڕوانە وێنەی ژمارە (٣) ئینجا ئەمجارەشیان دوو کلیک لەسەر (PROHIBIT ACCESS TO THE CONTROL PANEL) دەکەین لەو چوارگۆشەی کە دەردەکەوێت کلیک لەسەر (ENABLED) دەکەین دواتر OK دەکەین بەمەش کۆنترۆل پەنال لەسیستەمەکە ون دەبێت بۆ گەڕانەوەش هەمان کردار جێبەجێ دەکەین بەڵام ئەمجارەیان (NOT CONFIGURED) هەڵدەبژێرین کلیک لە OK دەکەین.



وێنەی (٣)

# ٢٥ هۆی خاوبوونەوەی کۆمپیوتەر

محمد نەوزاد تەیب

یەک : رێکنەکەوتنی هەندێ کارت لە ناوەوەی ئامێرەکە
دوو : زۆری کارتی تێکەڵاو لە ئامێرەکەدا .بەتایبەتی کارتی ڤیدیۆ و سیدی رایتەر
سێ : دابەزاندنی هەندێ بەرنامەی بێ کەلک
چوار : هەبونی هەڵە لە یەکێک لە فایلەکانی ویندۆز
پێنج : هەبوونی دوو رامی جیاواز
شەش : هەبوونی هەڵەی تەکنیکی لە مەزەربۆرد بەتایبەتی لە کارتەکان و رام
حەوت : بەرنامەی زۆرن ئەلارم ئەگەر بە راستی بەرنامەرێژ نەکرابێ
هەشت : دابەزاندنی پەرەکانی ئینتەرنێت بە بێ پەیوەندی
نۆ : کردنەوەی بەرنامەکانی مایکرۆسوفت ئۆفیس لەکاتی پەرەهەڵدانەوە
دە : گۆڕینی خێرا ی پەنجەرە کراوەکانی ئینتەرنێت
یازدە : بەرنامەی نۆرتۆن ئەنتی ڤایرۆس کە بە رێکی دانەبەزاندرابێت
دوازدە : کردنەوەی هەندێ بەرنامەی داونلۆد کراو.
سێزدە : هەبونی بەرنامەی گێت رایت
چواردە : زۆر ی ئەو پەڕانەی کە لەناکاو دەردەچن لە کاتی پەرە هەڵدانەوە
پانزە : کردنەوەی پۆرتی زۆر
شازدە : کردنەوەی فایلە نێردراوەکانی ماسنجەر
حەڤدە : کردنەوەی سایتی بەد ڕەوشتی
هەژدە : هەبونی بەرنامەی زۆر لەسەر هارد دیسک
نۆزدە : زۆر داونلۆدکردنی وێنە
بیست : هەبونی ڤایرۆس لە ناو کۆمپیوتەر
بیست و یەک : نوێنەکردنەوەی ئەنتی ڤایرۆس لە کاتی خۆیدا
بیست و دوو : چارەسەرنەکردنی هەڵەکان لە کاتی خۆیدا
بیست و سێ : دامەزراندنی ویندۆز لەسەر ویندۆز بەبێ فۆرمات
بیست و چوار : ئیشپێکردنی سیدی تێکچوو
بیست و پێنج : ڕەشنەکردنەوەی فایلە کاتی یەکانی ئینتەرنێت

سەرچاوە : منتدى العرب

# هەموو کلیلە تێکەڵاوەکانی ناو ویندۆز

ئامادە کردنی: باوکی کەماڵ




کلیلی ویندۆز+R

ئەگەر سەیری کیبۆردی کومپیوتەرەکەت بکەی لە تەنیشتی هەردوو کلیلی ALT ی لای چەپ و راست وە لە هەندی کیبۆردیشدا تەنها لە لایەکی کلیلی ALT کلیلیک هەیە کە وینەی ویندۆزی لە سەرە و بە کلیلی ویندوز ناسراوە. ئینجا ئەم کلیلە هەروا بە خۆرایی دانەنراوە، بەڵکو هەندێ کاری سەرەکی ئەنجام دەدات،بەلام لە بەر ئەوەی ئیمە بەزۆری ماوس (مشکولە) بەکاردینین تایبەتمەندیتی ئەم کلیلە نازانین. لێرە دا دەمەوێت ئەرکی ئەم کلیلە لە گەڵ چەند کلیلیکی تر روون بکەمەوە.

کلیلەکان بەم شیوەیەی خوارەوەن:

١-کلیلی ویندوز = پیشاندانی مینوتی ستارت ( دەستپیکردن)

٢- کلیلی ویندوز + D = گەران (گەشت کردن) لە نیوان ئایکونەکان وپەنجەرەکانی ویندوز

٣- کلیلی ویندوز + E = کردنەوەی EXPLORER ( MY COMPUTER)

٤- کلیلی ویندوز + F = کردنەوەی کرداری گەران بە دوای فایلەکان و دۆسییەکان (SEARCH RESULTS)

٥- کلیلی ویندوز + CTRL + F = کرداری گەران بە دوای ناوی کومپیوتەر لە توردا (شبکە) (SEARCH RESULTS-COPUTERS )

٦- کلیلی ویندوز + M = گچکە کردنی(MINIMIZE) هەموو پەنجەرەکان

٧- کلیلی ویندوز + SHIFT + M = گەرندنەوەی پەنجەرە گچکە کراوەکان بۆ حالەتی نورمال

٨- کلیلی ویندوز + R = پیشاندانی پەنجەرەی RUN

٩- کلیلی ویندوز + TAB = گەشت کردن لە نیوان دوگمەکانی TASKBAR

١٠- کلیلی ویندوز + BREAK = پیشاندانی زانیارییەکانی سیستەم (SYSTEM PROPERTIES)




کلیلی ویندۆز+BREAK

# ڕۆشناییەکی تەکنەلۆژیا بۆ نابینایانی کوردستان

**لەرێکەوتی ( ۲۰۰۵/۹/۲۲) بەچاودێری وەزیری تەندروستی بەرێز ( د.جەمال عبدلحەمید) بەئامادەبونی بەرێزان (پارێزگاری هەولێرو بەرپرسی لقی دوو ) بەرێز خاتوو (شنۆ وەزیری کارو کاروباری کۆمەلایەتی) ئیدارەی سلێمانی ژمارەیەکی بەرچاو لە میوانان وئامادەبوان هەستان بە کردنەوەی ناوەندی نمونەی فێرکردنی کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت بۆنابینایان بەزمانی برایل لە پەیمانگای رووناکی نابینایان لە پایتەختی کوردستان کە بۆیەکەم جار لەکوردستانی عێراقدا ئەم پرۆژەیە بکرێتەوە .**

**ڕیپۆرتاژ : ڕێناز ئەردەلان بەکر**
**فۆتۆ : هێرش ئیسماعیل**

**زانیاری پرۆژەکە :**

پرۆژەی (JAWS) یەکێکە لەو پرۆژە تازانەی حکومەتی هەرێمی کوردستان (وەزارەتی کارو کاروباری کۆمەلایەتی ) لەپێناو پەرەپێدانی کەم ئەندامان بەگشتی و نابینایان بەتایبەتی کە لەکوردستان ئەنجامی دەدات کەبریتیە لەبەکارهێنانی سیستەمێکی جیهانی تازە بۆئەوەی نابینایانیش وەکو هەموو مرۆڤێک بتوانن سوود لەتەکنەلۆژیای تازە وەربگرن وەسودمەندبین بۆ ئاسانکردنی پێداویستیە ڕۆشنبیری و زانستی و پەروەردەی وە پەیوەندیەکانیان بەژیان و داهاتویانەوە کەمرۆڤایەتی کەلکی زۆری لێ وەرگرتوە وەکۆمپیوتەری بەستراو بەتۆری جیهانی ئەنتەرنێت بەشێوەیەکی بەردەوام بۆسەرجەم نابینایان و قوتابی و ڕۆشنبیرو کارامە لەبواری بەکارهێنانی سیستەمی چاپی (برایل) کەوا ئامێری تایبەت بەهۆی پەنجەو هەستی بەر کەوتن بەزمانی کوردی و عەرەبی و ئینگلیزی دابین کراوە بۆ ئەوەش (۳) کەس لەمامۆستایانی پەیمانگای روناهی بەهاوکاری کۆمپانیایی (MALIA OVERSEAS) راهێنراون بۆئەوەی ئەوانیش زانیاری بەکارمەندانی تربدەن لەپێناو فێرکردنی نابینایان .

هەر بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی ئەم پرۆژەیە بۆ چونی چەند بەرێزیکمان وەرگرت لەوانە :

**بەرێز سمیر موسی ئەندازیاری کۆمپیوتەر لەکۆمپانیای (Malia overseas ) لوبنانی دەلێت :**



مەبەستی هاتنی ئێمە بۆ هەرێمی کوردستان بەستنەوەی (۳۰) کۆمپیوتەرە بەتۆری ئەنتەر نێت لەسەنتەری نابینایان .پرۆگرامی تایبەتیمان هەیە کەیارمەتی نابینا دەدات هەرچی نوسین و پرۆگرام هەیە لەسەر شاشە بتوانێ بیخوێنێتەوە سیستەمی ئێمە پێک هاتووە لەسیستەمی (SERVES ) لەگەل هەموو جێ بەجێ کارەکانی ئەم سیستەمە .نابینایانی کوردستان جۆرە توانایەکی بێ وێنەیان هەیە بۆ فێربوون لەبەر ئەوەی بۆفێربونی ئەم خولە ئێمە بانگهێشتی سێ لەکارمەندانی هەرێمی کوردستانمان کرد بۆلوبنان کەتوانایەکی چاکیان هەبوو توانیان لەماوەی دوو مانگ بەچاکی فێری کۆمپیوتەر بن ئەنتەرنێت بەکاربهێنن هیوادارم ئەم پرۆژەیە هەموو نابینایانی کوردستان تێدا بەژداربن بۆئەوەی بتوانن لەم جیهانەی تەکنەلۆژیایە بێ بەش نەبن .

**بەرێز مامۆستا موەفەق ئەکرەم کانی مامۆستا لە پەیمانگایی نابینایان بەم شێوەیە هاتە دوان :**






ئەم پرۆژەیە بیرۆکەی بەڕێز (د.جەمال عبدلحەمید) بوو گوتی بۆ پـەرە پێدانی ئـەم پرۆژەیە داوای لە ئێمە کرد کەبچین بۆلوبنـان بۆئـەوەی لەوێ خـول ببینین بۆفێربـوون و کارکـردن لەسـەر ئـەم پرۆژەیـە .کاتێکیـش چویـن بـۆ لوبنان خولەکـەی ئێمە بۆماوەی دوومانگ بوو، ناوەندێکی تایبەتی هەبو بۆ ڕاهێنانی ئێمە ڕۆژانە کەلە کات (٩) بەیانی بوو تاوەکو (٤) ی ئێـوارە. ڕاهێنانەکـەش بـۆ ئـەوە بوو کە هـەر نابینایەک خوێندەوارە ئێمە بتوانیـن فێری نوسـین و پرۆگرامەکانی کۆمپیوتەریان بکەین بەهەر سـێ زمانی (کوردی،عەرەبـی، ئینگلیـزی )،لـەدوای ئەوەی فێری کۆمپیوتەر دەبن دوای بچنە ناو دنیایی ئەنتـەر نێت وەک هەرتاکێکی تـری ئـەم کۆمەڵگایە بتوانـن پەیوەندی بەجیهانەوە بکەن .

**بەڕێز کەمال عەساف لەکۆمپانیایی (Media Look) لوبنانی تایبەت بەئامێری تایبەت بۆنابینایان گوتی:**

ئێمە وەک کۆمپانیایی (MEDIA LOOK) سـەبارەت بـەم پـرۆژەیە ئێسـتا لە کوردستان کۆمپانیای (MALIA OVERSEAS)



هاتنە لای ئێمە بۆ ئـەوەی هاوکاریان بکەین سـەبارەت بـەم پـرۆژەیـە لەبەر ئـەوەی کۆمپانیاکەی ئێمە بـەرنـامـەو ئامێرەکانی تایبەتە بەنابینایان ئێمەش زۆر بەخۆشحالیەوە هاوکاریمان کردن ئـەوە بـوو ئێمـە هـاتیـن بـۆ هـەرێمـی کوردستان بۆ ئەوەی کار لەسەر ئەم پرۆگرامـە بکەین بـەرنـامـەکـان بـەرەو پێش ببەین .هەوڵماندا هەندێک کاربکەین کەوەک کار ئاسانیەک چۆن پەرەمان بەزمانی برایلی (عەرەبی) داوە ئەوهاش پەرە بەزمانی (برایلی کوردی) بدەین .من

ئەم کارانە بەتاقی کردنەوەیەکی زۆر خۆش دادەنێم لەبەر ئەوەی وامان لێ دەکات کە لە خۆمان ڕازی بین هەست بەوە بکەین کە کارێکمان کردوە سود بەنابینایان دەبەخشێ .هـەر سەبارەت بەم پرۆژەیە لەکوردستان پرۆژەیەکی زۆر جوانە و کەوادەکات نابینا بنوسێ و چاپ بکات بەبرایل بە ئامێری کۆمپیوتەر لـەبـەر ئـەوەی لـەگـەڵ ئـامێـرەکـانی کۆمپیوتەر ئامێری چاپی برایلی لە گەڵە هەر بەوهۆیەشەوە دەتوانێ لەئەنتەر نێت بەژدار بێت .ئەم ناوەندەش بەگرنگترین ناوەند دادەنرێ لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لـەڕوی قـەبـارەو جـۆرەوە وە هیوای سەرکەوتنیان بۆ دەخوازم .

**هەر سەبارەت بەم پرۆژەیە بەڕێز مامۆستا صدیق عوسمان بەڕێوەبەری پەیمانگای ڕوناکی نابینایان دەڵێت:**



ئەمڕۆ ڕۆژێکی زۆر خۆشـە سەبارەت بەئێمـەوە زۆر خۆشـحالین بەکردنـەوە ئـەم ناوەندەی کۆمپیوتـەرو ئەنتەر نێت بۆنابینایان کە سوپاس بۆخوا بەهەوڵ و ماندوو بوونی دڵسۆزان و خەم خۆرانی نابینایان لە وەزارەتـی کارو کارو باری کۆمەڵایەتـی بـە پشـتیوانی حکومەتـی هەرێمی کوردسـتان و وەزارەتی دارایی بیرۆکـەی ئـەم پرۆژەیـە بەڕێـز (کاک د.جەمـال عبدلحەمیـد) بـوو وەزیـری تەندروسـتی لەرێگای پەیوەنـدی و سـەردانی بۆ وولاتی لوبنـان کەهەردەم لوبنان هەولی بەردەوامی داوە بوچین و تویـژی کەم ئەندامـان .کەواتە لەرێگایی

ئەوانەوە بوو کە ئەم پڕۆژە لێرە بەئەنجام گەیشت هەرلەڕێگای ئەوانیش ئەم پڕۆژە پێشکەش بە حکومەتی هەرێمی کوردستان کرا کەبەسوپاسەوە ڕەزامەندیان پێشان دا وە ئەم ناوەندە کرایەوە وەک ئەوەی وا لەپێش چاوانە وەئومێدی ئێمە ئەوەیە کە ئەوزانست و زانیاریانەی ئێمە لە لوبنان فێری بوین،نابینایانی کوردستان و سەرتاسەری عێراق ڕابهێنین بۆ چۆنیەتی فێر بوون و بەکار هێنانی کۆمپیوتەر و ئەنتە رنێت،بۆئەوەی ئاڵ و گۆری زانیاری بکرێ لەنێوان نابینایانی کوردستان و نابینایانی هەموو جیهان .

**هەروەها بەڕێزمامۆستا لوقمان شەوکەت مامۆستای نابینا لە پەیمانگای نابینایان بەم شێوەیە تیشکی خستە سەر ووتەکانی :**



سەبارەت بەم پڕۆژەیە بۆئێمە گرنگی خۆی هەیە لەسێ چوار ڕووەوە لەوانە وەک خاڵی پەیوەندی وایە لەنێوان نوسینی چاو ساغ و نوسینی بڕایل وادەکات کەنابینا لەنوسینی چاو ساغ تێ بگات هەروەها چاوساغیش بتوانێ هی نابینا بخوێنێتەوە،دووەم شت هەموو جۆرە پەرتوکێک دەخاتە بەر دەست بۆ نابینا،هەروەها بەکارهێنانی تۆڕی ئەنتەرنێت دەتوانێ پەیوەندی بەجیهانەوە بکات،هەروەها لەرووی بەرنامەوە دەتوانێ داهێنان بکات بۆ نموونە لە لوبنان کەسێکی نابینا هەبوو بڕوانامەی ئەندازیاری لە (مایکرۆسۆفت) بەدەست هێنابوو داهێنانێکی کردبوو کۆمپیوتەری خێرا کردبوو بۆ نابینا،مەبەست لێرە ئەوەیە کەنابینا هەیە لەگەڵ نەبوونی چاو زیرەک و بەتوانایە بۆ یە ئەگەر تەکنەلۆژیایی لەبەر دەست دابێ دەتوانێ داهێنانی زۆر بکات .بۆیە ئێمەش دەتوانین ئەونابینایانەی کە لەکوردستانن و ووەزە و توانایان هەیە داهێنانی نوێ بکەین بۆ ئەوەی سود وەرگرن و بتوانن خۆیان پێش بخەن .

**ئەندازیار منعم**

**بەڕێوەبەری پڕۆژەکە دەڵێت :**



ئەم پڕۆژەیە کاتێک دەستی پێ کرد ئەوکاتەی کە (د. جەمال عبدلحەمید) هاتە لوبنان پێم گوت کەمن پڕۆژەیەکم هەیە کەبەدرێژای تەمەن خەوم پێوە دەدیت کە لەکوردستان بەئەنجامی بگەیێنم کاتێک پڕۆژەکەم پیشان دا زۆر بەخۆشحاڵیەوە بەڕێزی ڕازی بوو پەیوەندیمان بە (د.شیلان) کرد ئەویش بە خۆ شحاڵیەوە ڕازی بوو .(سێ) کارمەندیان لە هەرێمی کوردستانەوە هاتنە لای ئێمە بۆ ئەوەی لەم بوارە خول ببینن، ئەوە بوو ئێستا ئەم ناوەندە کرایەوە ناوەندێکی زۆر ڕێک و پێک و مۆدێرنە ئەم پڕۆژەیە نوێترین پڕۆژەیە لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست لەم پڕۆژەیە لەگەڵ نوسین لەئامێرەکانی کۆمپیوتەر دەنگ هەیە بە زمانی (عەرەبی – ئینگلیزی) ئێمە هەوڵ دەدەین ئەم دەنگە بە(کوردی) ش دابین بکەین .ئێمە هەردەم هاوکار دەبین لەگەڵ بەرپرسانی کوردستان ئامادەین بەهەموو شێوەیەک یارمەتی خەڵکی کوردستان بدەین .



# چۆن وا لە ئیمەیلەکەت دەکەیت کە ڕاستەوخۆ وەلامی نامەی هاتوو بداتەوە (automatic message response)




وێنەی (١)

ئامادەکردنی:هیمداد رحمان حمد

بۆ ئەوەی لە ئیمەیلەکەتدا دەست بەجێ وەلامی نامەی هاتوو بدەیتەوە بەشێوەی ئۆتوماتیکی ئەم خالانەی خوارەوە جیبەجی بکە

١- دوای چوونە ناو ئیمەیل کلیک لەسەر MAIL OPTION بکە (وێنەی ژمارە ١).

٢- لە بەشی MAIL OPTIONS کلیک لە VACATION RESPONSE بکە (وێنەی ژمارە ٢).

٣- لە بەشی VACATION RESPONSE کە بریتیە لە ئامادەکردنی نامەیەک بۆ وەلامی ئەو نامانەی دێتە ناو ئیمەیلەکەت بەم شێوەیە:

أ- لە START DATE دا ڕۆژو مانگ و سال دیاری دەکەی بۆ ئەوەی لە و بەروارەدا ئیمەیلەکەت وەلامە نامەی هاتوو بداتەوە بەشێوەی AUTOMATIC (وێنەی ژمارە ٣).

ب- لە END DATE دا ڕۆژو مانگ و سال دیاری دەکەی بۆ ئەوەی لە و بەروارەدا ئیمەیلەکەت کۆتایی بە وەلام دانەوەی نامە بێنێت (وێنەی ژمارە ٣)

ج- لە GENERIC RESPONSE نوسراوێک ئامادە دەکەی بۆ نمونە دەنوسیت (SLAW BAREZ PAYAMAKAT GAYSHT SUPAS BO NARDNI

NAMAKAT) ، ئەمــە وەڵامێکــە بــۆ هــەر نامەیەک کە دەگاتە ناو ئیمەیلەکەت.

د- لــە SPECIAL RESPONSE (OPTIONAL نوسراوێک ئامادە دەکەی بۆ نمونە دەنوسیت (SLAW BAREZ SUPAS BO NARDNI NAMAKAT. BAREZ BBURA AM MAWAYA NATWANM BT BENM BAHOY KARY TAYBAT) بۆ دوو ئەدرەسی دیاریکراو کە خۆت دیاریان دەکەی بۆ چ ئەدرەسەک ئەم نوسراوە دیاریکراوە بڕوات (وێنەی ژمارە ٣)

ە- پاشـان نوسینی دوو ئـەدرەس کـە دەتـەوێـت نـوسـراوی(SPECIAL RESPONSE (OPTIONAL ببێت بە وەڵام کاتێک کە نامەی بۆ ناردی.

و- کلیکی ئایکۆنی SAVE بکە .



وێنەی (٢)

وێنەی (٣)

# هۆشداریەک لەسەر پشت بەستن بە ئامۆژگاری یەکانی پزیشکی لە ئەنتەرنێتەوە

وەرگێرانی لەعەرەبییەوە:
شەیماء حوسامەدین

قوتابیانی پزیشکی هۆشدار یەکیان بڵاوکردۆتەوە سەبارەت بەوەی کەنەخۆشەکان خۆیان ئەخەنە مەترسی یەوە ئەوکاتەی پشت دەبەستن بەئامۆژگاریەکانی پزیشکی نادروستی پیشکەش کراو لەئەنتەرنێتەوە.

هەروەها قوتابیانی پزیشکی داوایان کردوە بەدانانی بنەمایەکی ڕاست و دروست بۆ ئامۆژگاری یەکانی پزیشکی کە لەئەنتەرنێتەوە پیشکەش دەکرێت، لەبەر مەترسی وەرگرتنی ئامۆژگاری هەڵە لەلایەن نەخۆشەوە کەپشتی پێ دەبەستێت و لە کۆنگرەی کۆمەڵەی پزیشکی بەریتانی ئەم بابەتە و چەند بابەتێکی تر تاووتوێ کران کەدێتە بەردەم ڕێگای پزیشکانی دوارۆژ.

وەبابەتی تر کەقوتابیانی پزیشکی پێوەی سەرقاڵن ئەمیش تاقی کردنەوەی هەرەمەکیە بۆ پزیشکان لەسەر خواردنەوە و ماددە بێ هۆش کەرەکان وەلیستەکانی ڕێکخەری کاروباری پزیشکانی تەندروستی دوایی مەسەلەی (هارولد شیجان) کە بەکوشتن (١٥) پانزە نەخۆش لە نەخۆشەکانی تۆمەت بارکرا.

وە لەگفتوگۆیەک بۆ (بیبیسی) اوتلاین، (ایما بریتان) کە قوتابیە لە قوناغی کۆتایی کولیژی پزیشکی ووتی : کەهیچ شک و گومان نییە خەڵک لەدوا ڕۆژ زیاتر پەنا ئەبەن بۆ ئەنتەرنێت بۆیە لەسەر پزیشکان پێویستە کە ئەمە بە کارێکی چاک وەربگرن. بەڵام لەبواری دووەم دا بەهەمان شێوە لەسەر پزیشکان پێویستە



کە ئاگادارییەکی تەواو و پێویست پیشکەش بەخەڵک بکەن لەسەر ئەگەری مەترسی لەسەر ئەم کارە.

هەروەها (بریتان) دەڵێت کەئەمیش تووشی ئەم ڕووداوە هاتووە کە جارێکیان یەک لەنەخۆشەکانی هاتەلای و زانیاری هەڵەی پێداوە بۆیە لەسەر پزیشکەکەی پێویستە کەبۆ نەخۆشەکەی ڕوون بکاتەوە کەئەم زانیارییانە هەڵەیە و پێویستە دووبارە زانیاری دروست کۆ بکاتەوە و ئامادەی بکات.

بریتان دەڵێت: ئەوزانیاری یانەی کەلەئەنتەرنێتەوە پیشکەش دەکرێت پێویستە لەلایەن پزیشکانەوە ڕێک بخرێت کە هەرچەندە ئەمەکارێکی قورسە.

بەڵام دەتوانرێت بەلایەنی کەمەوەلەیەک ناوچە (موقع) دا زانیاری باوەڕپێکراو بڵاوبکرێتەو خەڵک سودی لێوەربگرێت. کەچی (هیلین مینل) کەقوتابیە لە نەخۆشخانەی (سان تۆماس)ی فێرکردن لە لەندەن، داوادەکات کەتاقی کردنەوەی هەرەمەکی ئەنجام بدرێ لەسەر پزیشکان لەبواری خواردنەوەو مادە بێهۆش کەرەکان چونکە ئەمانە چینێکی گرنگن و بەرپرسیاریەتیەکی گەورەو گرنگیان لەناو کۆمەڵ وەرگرتووە. هەروەها دەڵێت ئەگەر هەر پزیشکێک لەژێر کاریگەری هەرجۆرێکی خواردنەوە یان مادە بێ هۆش کەرەکان بێت کەکار دەکەنە سەر هۆشی ئەوا ژیانی نەخۆشەکەی ئەخاتە مەترسیەوە. هەروەها دەڵێت کەبەشێک لەپزیشکان دژی ئەنجام دانی ئەم تاقی کردنەوەن بەبیانویی ئەوەی ئەم جۆرە کردارو ڕەفتارانە دژی ئازادی تاکە کەسی یە و هەروەها دژایەتی گەورە تری لێچاوەڕوان دەکرێت لەلایەن پزیشکە کۆنەکان.

سەرچاوە :موقع الشامل

# چۆنیەتی بەستنی هێلی تەلەفۆنی ئاریافۆن بۆ ئەنتەرنێت

وێنەی (١)

**نبیل عبدالرزاق فتاح**
nabil_af@yahoo.com

هێلی تەلەفۆنی ئاریافۆن هەروەک هێلی تەلەفۆنی نورماڵی ئاسایی خزمەت گوزاری گواستنەوەی هێلی ئەنتەرنێتی هەیە، بۆ ئەم مەبەستە دەبێ کۆمپیوتەرەکەت کارتی تایبەتی USB تێدابێت، پاشان کێبلی تایبەت بە هێلی ئەنتەرنێت کەوا تایبەتە بە کۆمپانیای ئاریافون دەکرێت، تەلەفۆنەکەت لەگەڵ کۆمپیوتەر بەم کێبلە بگەێنە بەیەک.

بۆ پێناساندنی زانیاری تایبەت INSTALLING هێلی ئەنتەرنێت ئەم هەنگاوانەی خوارەوەت پێویست دەبێت:




وێنەی (٢)

١. لەسەر شاشەی کۆمپیوتەر ئایکۆنێک هەیە بەناوی INTERNET EXPLORER. کلیکی لای ڕاست بکە لەسەر ئەم ئایکۆنە پاشان ئەمری PROPERTIES هەڵبژێرە وەک لە وێنەی (١) دیارە.

٢. لە ویندۆی PROPERTIES لەسەر لاپەڕەی CONNECTION کلیک بکە پاشان لەسەر دووگمەی ADD... کلیک بکە، وێنەی (٢)، ویندۆیەکی تازە دەکرێتەوە، لەسەر NEXT کلیک بکە بێ ئەوەی هیچی تر دەستکاری بکەی.

٣. ویندۆیەک دەکرێتەوە وەک (وێنەی ٣) بۆ نووسینی ژمارەی تەلەفۆن، ژمارەی تەلەفۆن پێویستە بەم شێوەیە بنووسرێت #777 لە شوێنی تایبەتی خۆی.

٤. پاش کرداری ژمارە ٣ کلیک بکە لەسەر دووگمەی NEXT پاشان FINISH.

٥. لەم هەنگاوە ناوی بەکارهێنەری کۆمپیوتەر لەگەڵ ووشەی نهێنی دەنووسیت ئەویش بەم شێوەیە دەبێت هەروەک لەوێنەی (٤) دیارە:

USER NAME: EDJV

PASSWORDS: EDJV

ئێستا پاش نووسینی ئەم زانیاریانەی سەرەوە تایبەت بە خالی پێنجەم کلیک بکە لەسەر OK.

٦. بەرنامەی INTERNET EXPLORER بکەوە، لە شوێنی ADDRESS بنووسە HTTP://WWW.YAHOO.COM پاشان دەست بنێ بە دووگمەی ENTER لە کیبۆرد، چاوەڕێ بە تاوەکو ئەم ماڵپەڕە دەکرێتەوە.

ئێستا هێڵی ئەنتەرنێت ئامادەیە، هیوادارم بتوانیت سوودی لێ وەربگریت.

وێنەی (٣)

وێنەی (٤)




# دیزاینێکی سادەو خزمەت گوزاریەکی بێ وێنە هۆکاری سەرکەوتنی ماڵپەڕی گۆگڵە

ستافی گۆڤار

هەموو ئەوانەی کار لەگەڕانی زانیاریەکان دەکەن لەسەر ئەنتەرنێت وە ئەوانەش تەنها بۆ هەرمەبەستێکی تربێت سەردانی ماڵپەرەکان بکات ناوی گۆگڵیان بیستوە تا ئەو ڕادەی گۆگڵ توانی دەست بەسەر تەواوی ئەنتەرنێت دابگرێت بۆ گەڕان و هەموو خەلک لە سەرانسەری جیهان پەیوەست بکات بەخۆی و بەدوای زانیاری دابگەڕێت لە ئەنتەرنێت لە ڕێگای سایتی گۆگڵەوەیە ئەمەش لە ئەنجامی خێرایی گەڕان و ورد لە گەڕاندا . وەکو لە ماڵپەرەکەشەوە هاتووە ئەم سایتە لە ساڵی ١٩٩٨ دامەزراوە لەلایەن دوو خوێندکاری دکتۆرا لە زانکۆی ستانفۆرد . دوای ساڵێک لە دامەزراندنی ئەم سایتە کۆمپانیایەکی بازرگانی پەیمان نامەیەکی لەگەڵ بەستن بەبڕی ٢٥ ملیۆن دۆلار . ناوی گۆگڵ کەڕەنگە زۆرمان پرسی بێت کە لە چیەوە هاتوە لە ڕاستیدا ئەم ناوە سەرنجی ئەم دوولاوەی بۆ لای خۆی ڕاکێشاوە هەربۆیەش بەم ناوە نراوە کە بەمانای ژمارە یەک دێت کە ١٠٠ سفری لە دوا بێت، لەهەمان کاتدا تەواوی هەوڵیان داوە تاکو بەئاسانترین شێوە دیزاینی بۆ بکەن . لە ماڵپەڕی گۆگڵدا زیاتر لە ٨٠٠ کارمەند کاردەکات کە ٦٠ لەو کارمەندانە بڕوانامەی دکتۆرایان هەیە لە ١٢ نوسینگە لە سەرتانسەری جیهاندا لە ولاتانی (ئەمریکا، کەنەدا، ئەڵمانیا، ایتاڵیا، هۆلەندا، یابان، فەرەنسا) ئەم ماڵپەڕە لەلایەن کومپانیایەکی تایبەت بەڕێوە دەبردرێت بەناوی (کلینیر بیرکینس) وە بەشێکیش لە داهاتەکەی

بەر زانکۆی ستانفۆرد دەکەوێت .
ئەم ماڵپەرە تاکو ئێستا زیاتر لە ١٥٠ خەڵاتی وەرگرتوە وەکو باشترین ماڵپەرو وەکو باشترین بزوێنەری گەران و وە یەکێکە لەو ١٠٠ ماڵپەرە جیهانیەیەی کە بەهەرە باشترین ماڵپەرەکان دادەنرێن وچەندان خەڵاتی تریش وەکو باشترین بزوێنەری گەران وەرگرتوە، هەڵسەنگێنەرانی بواری ماڵپەر و ئەو کەسانەی گۆگڵ بەکار دێنن هۆکاری سەرەکی سەرکەوتووی ئەم ماڵپەرە دەگەرێنەوە بۆ ورد لە گەران و خێرا لە گەران و سادەیی ماڵپەرەکەیە کە نابێتە هۆی دواکەوتنی ماڵپەرەکە لەکاتی کردنەوەی، بەپێی دواین ئامار لەسەر ژمارەی ئەو ماڵپەرانەی گۆگڵ بەنزیکەی ٣٠ ملیار ماڵپەر دەخەملێنرێت کە لەناو بزوێنەری گۆگڵ دەدۆزرێنەوە . ئەمە سەرەرای ئەوەی کە دەتوانرێت بەدوای وێنەش بگەرێت کە بە ئاسانترین شێوە نمایشیان دەکات زیاتر لە ٤٢٥ ملیۆن وێنەی تێدایە، لەم دوایانەدا چەند پەیوەستنامەیەکی لەگەڵ چەند کتێبخانەیەکی ئەلیکترونی جیهانی مۆرکرد بۆ نمایشکردن و فرۆشتنی یەک ملیۆن کتێبی ئەلیکترونی، جگە لەمەش تایبەتمەندیەکی تریش لە گۆگڵ بریتیە لە راستکردنەوەی ئیملایی ئەو رستەی کە نوسیوتە لەگەڵ پیدانی چەند هەڵبژاردەیەک نزیک لەم وشەیە، ئەوەی جێگای سەرسورمانە لەم ماڵپەرە رۆژانە زیاتر لە ٢٠٠ ملیۆن کەس سەردانی ئەم ماڵپەر دەکەن کە نیوەی زیاتر لە دەرەوەی ئەمریکایە .ئەم ماڵپەرە داهێنانێکی لە گەراندا کردوە ئەویش بریتیە لە هەڵگرتنی دانەیەک لە ماڵپەرەکە وەکو ئەرشیف کاتێک ئەم سایتە داخرا ئەوا تۆ هەر دەتوانیت لە گۆگڵ بەدوای بگەرێیت وە دەتوانیت لە رێگای بەشی هەڵگیراو (CACHED) بگەیتە ئەم ماڵپەرە . وە دەتوانین بەدوای ئەو فایلانە بگەرێیت کە لە شێوەی PDF یان EXE یان DOC دان ئەویش بەنوسینی ناوی بابەتەکە ئینجا ئەم پاشبەندە دەنوسین . بەم شێوەیە (FILETYPE:PDF) یان هەر پاش بەندێکی تر بێت .
دەتوانین لە ناوی ماڵپەرەکان بگەرێین ئەگەر لە نوسین نەگەیشتینە هیچ دەرەنجامێک بۆ نمونە بەم شێوەیە دەگەرێین (SITE:WWW.DOMAIN.COM). لە کۆتایی سالی ٢٠٠٠ دا ئەم ماڵپەرە بەرنامەیەکی بچوکیان دروست کرد کە دەتوانرێت پالپشتی ئەنترنێت ئێکسپلۆوەر بکات بەمەش گۆرانێکی نوێ بوو بەنسبەت ئەم ماڵپەرە چونکە دەتوانرێت بەبێ ئەوەی ئەم ماڵپەرە بکەیتەوە بەدوای زانیاریدا بگەرێیت ئەویش بەدەرکەوتنی شریتی گۆگڵ لەسەر ویندۆزەکەدا . لەکارە جوانەکانیش لەم ماڵپەرە دا بریتیە لە ریزبەندی سایتەکان بەپێی ئەو داواکاریەی لە گەراندا کردوتە، لەم دوایانەش بەشێکی تر لە گۆگڵ زیاد کرا ئەویش بریتیە لە (GOOGLE EARTH) کە دەتوانیت زانیاری لەسەر هەموو جیهان کوبکەیتەوە ئەم برگەیە لەژمارە ٣ گۆڤاری کۆمپیوتەر باس کراوە .



# نوسخەی نوێ لە مایکرۆسۆفت WINDOWS VISTA

ستافی گۆڤار




کۆمپانیای مایکرۆسۆفت بڵاوی کردەوە کە پرۆگرامێکی نوێ لە ژێر ناونیشانی WINDOWS VISTA لە پاش بڵاوکردنەوەی تەواوی لە ژێر ئەم ناونیشانە لە پەڕێکی نوێدا کە بڵاوی کردۆتەوە لەم دوایە کە ئەم نوسخەیە بۆ ئەو کەسانەیە کە پەرە بەکارەکانیان دەدەن وە بۆ زانایانی تەقەنی زانیاری تاکو ئیستا .

گرینگترین شت کەوا دەبێتە هۆی سەرنج راکێشانی بەکارهێنەران کە خێرایی زۆرە و بەهێزە لەسە رەتای کاری پرۆگرام لە کاتی ئیشپێکردنی کەوا کاتێکی زۆری ناوێت تاوەکو ویندۆز کاردەکات وەک لەڕابردوو وە هەروەها ئاسانی بەڕێوەبردنی پرۆگرام وە ڕێکخستنی ساکارە بۆ کارپێکەران.

ئەوەی تر کە WINDOWS VISTA لە خێزانی ویندۆز NT بۆیە پێی دەڵێن WINDOWS V6

## HOTMAIL جەنگی مانەوە لە لوتکە

گرنگترین ئەو گۆڕانکاریانەی کە روودەدات خزمەت گوزاری بەشێوەی بەرنامەی OUTLOOK و OUTLOOK EXPRESS دەبێت کەوا ڕوبەرزیادی و بەڕێوەبردنی پۆستە بە ئاسانی وە ڕێکخستنێکی زیاتریش.وەهەروەها زیاد کردنی ڕوبەری هەلگرتن (التخزين)ی بەخۆڕایی بۆ ٢ گێگا بایت ئەمەش بۆ مانەوەی لە بازاری پۆستەی ئەلیکترۆنی.

گەورەترین ڕکابەر(منافس) بۆ هۆتمیل لە بازاری پۆستە دوانن پۆستەی یاهو وە پۆستەی جی میل کە سەر بە گوگلە.

تێیدادەبێ ئەم جارە تەقەنیاتی پارێزگاری مەزن کە گرینگترینیان پاراستنی نامەی (مزور)ە کە ناودەبرێ ANTIPHISHING هەروا توانای پیشاندانی نامە بێ ئەوەی بیکەیتەوە وە ئامادەی کە هەر نێردراوێک BLOCK بە تەواوی لەبەرنامەی OUTLOOK .

هەروەها شتی نوێ لە ماسنجەر MSN MESSENGER وەک بەشێکی هاوبەش SHARED FILE FOLDER کە دایدەنێ کارپێکەر هەر لیستێکی بۆ هاوڕێکانی کە ڕاییکێشن لە کۆمپیوتەر هێمایەک ئاگادارت دەکاتەوە لە کاتی هەر لێکچوونێک بە تووش بوونی کۆمپیوتەری کەسی دووەم بە قسەکردن بە هەر ڤایروسێک بە پشتگیری (خدمة) MICROSOFTS ONECARE SUBSCRIPTION ANTIVIRUS

# چی دەکەیت ئەگەر ئەو نامەی بۆت هاتبوو نەخوێندرێتەوە

شاخەوان عمر حسن

زۆر جار ئەو نامانەی کە لە هاوڕێکانمان بۆمان دێن بەشێوەی هێماو ڕەمز لەسەر ئیمێلەکە دەردەکەون بەمەش ناتوانرێت ئەو نامەیە بخوێنرێتەوە، ئەم حاڵەتەش بەزۆری لە نامە کوردی و عەرەبیەکان دروست دەبێت وەک لە وێنەی ژمارە ( ١ ) دیارە، نامەکان بەم شێوەیە دەردەکەون . بۆ چارەسەری ئەم حاڵەتەش بەڕێگایەکی زۆر ئاسان دەتوانین بەسەر ئەم هەنگاوەدا زاڵ بین.

لەسەرتادا کە بینیمان نامەکە تێکچوە ئەوا یەکسەر دەچینە سەر (VIEW) لەوێ کلیک دەکەین دواتر کلیک لەسەر (ENCODING) کلیک دەکەین لەویش لیستەک دێت ئێمە (ARABIC WINDOWS) هەڵدەبژێرین دەبینین ڕاستەوخۆ نامەکە دێتەوە سەر شێوە ئاسایەکەی خۆ وەک لەوێنەی ژمارە (٢) دیارە . خۆ ئەگەر ویندۆزی عەرەبی لەوێ دیار نەبوو ئەوا دوای کلیک کردن لەسەر (ENCODING) ڕاستەوخۆ کلیک لەسەر (MORE) دەکەین و لەوێ کلیک لەسەر (ARABIC WINDOWS) دەکەین بڕوانە وێنەی ژمارە (٣) دواتر وەک لەوێنەی ژمارە (٤) دیارە نوسینەکان دێنەوە سەر بارە سروشتیەکەی خۆی و بەڕونی نوسینەکان دەخوێندرێنەوە .


وێنەی (١)


وێنەی (٢)


وێنەی (٣)


وێنەی (٤)

# چۆنیەتی دابەش کردنی هارد دێسک و دانانی زیاتر لە سیستەمێک بەهۆی بەرنامەی partition magic

ئامادەکردنی: ک. خۆشناو

**پێشەکی :-**

**بەرنامەی PARTITION MAGIC بە یەکێک لەبەرنامە خزمەتگوزاریەکان دادەنرێت کە زۆر ئاسان کاری کردووە بۆ بەش کردنی هارد دێسک بۆ چەندین بەش، بەهۆی ئەوەی بەرنامەکە لە هەردوو سیستەمی دۆس و ویندۆز کاردەکات بە ویستی خۆت، وە بەرنامەکە ڕزگارت دەکات لە ڕێگای تەقلیدی بەکارهێنان بۆ بەش کردنی هارددسک لە دۆس کە فەرمانی FDISK بەکاردەهات، کە بەڕێگایەکی کۆن دانەنرێت وە تا ئێستاش پێش دابەزاندنی ویندۆز بەکاردەهێنرێت، کە ئەمیش ڕێگایەکی زۆر بەسەر ئێشەیە وە زانیارییەکی تەواوی دەوێت لەسەر فەرمانەکانی دۆس، وە دەبێ لە بەکارهێنانی ئەم بەرنامەیە ووردو بە دیقەت بین، چونکە ئێمە کار لەسەر هاردوێرێکی گرنگ دەکەین کە ئەویش هارد دسکە، کە لەوانەیە پڕبێت لە زانیاری بەسوود بۆیە دەبێ ئاگاداربین .**




وێنەی (١)

ئێستاش خاڵ بە خاڵ باسی بەرنامەی PARTITION MAGIC دەکەین:-

یەکەم / دابەزاندنی بەرنامەکە.

کاتێک دەگەینە کۆتایی دابەزاندنی بەرنامەکە ئەویش بریتییە لە کوپی کردنی مەلەفی بەرنامەکە بۆ سەر فلوپی دیسک، کە بریتی دەبێت لە دیسکی فریاگوزاری (CREATE RESCUE DISKETTE)، کە لەرێیەوە دەتوانی بەرنامەکە بخەیتە کار لەناو دۆس لەکاتی پەیدابوونی کێشەو گیروگرفت لە ویندۆزدا، ئەویش بەوەی فلۆپی بخەرە ناو درایڤەری فلۆپی، وە دەست دەکات بە کۆپی کردنی مەلەفی بەرنامەکە، لەپاشان کۆتایی بە دابەزاندنی بەرنامەکە دێت بۆ سەر ئامێرەکەت، ڕێگایەکی تر بۆ دروست کردنی دیسکی فریاکەوتن لە پاش دابەزاندنی بەرنامەکە بەم شێوەیە بڕۆ بۆSTART دوایی PROGRAM وە هەڵبژاردنی CREATE RESCUE DIKETTE، وە ئاگاداربە لە پاراستنی ئەم دێسکە، چونکە دەبێتە فریاگوزار کاتێک تووشی کێشەیەک دەبیت لە کاتی بەش کردنی هارد دیسک، وە لە ڕێگایەوە دەتوانی کێشەکە چارەسەر بکەیت .

دووەم :- دابەش کردنی هارد دێسک.

بۆ نمونە ئێمە هارد دێسکێک دەکەین بە دووبەش، پاش کردنەوەی بەرنامەکە دەبینین هارد دێسک پێکهاتووە لەیەک بەش (C)، بڕوانە (وێنەی ژمارە ١)، بۆ ئەوەی کارەکەمان بە شێوەیەکی ئاسایی بڕوات پێویستە سیستەمی دیسکەکان بگۆڕین بۆ FAT32 بو شێوەیە، بڕۆ بۆ لیستی OPERATION دوایی CONVERT پاشان CONVERT FAT TO FAT32 وە بەو شێوەیە توانیمان سیستەمی خەزن کردنی مەلەفات بگۆڕین بۆ FAT32، پاش




وێنەی (٢)

ئەمە بە کلیکی ڕاستی ماوس لەسەر بەشی (C) RESIZE /MOVE هەڵبژێرە، پەنجەرەیەکی تر دەکرێتەوە وەکو لە وێنەکەدا دیارە ( وێنەی ژمارە ٢ )،هەڵسە بە ڕاکێشانی ڕاستەکە بۆ ناوەڕاستی بۆشاییەکە وە یەکسان کردنی هەردوو بەش، وەک دیارە لەوێنەکە (وێنەی ژمارە٣ ) لە دوایی OK بکە، پاش ئەوە بە کلیکی ڕاستە لەسەر ئەو بەشە نوێیەی کە ڕەنگێکی خاکی هەیە CREATE هەڵبژێرە، دەبینین پەنجەرەیەکمان بۆ دەکرێتەوە (کە زۆر گرنگە) وێنەی ژمارە٤)، لەبەر ئەوە پێویستە ڕێگاکان زۆر بە وردی بگرینە بەر، یەکەم جار هەڵسە بە گۆڕینی سیستەمی مەلەفات بۆ FAT32 وە کو لەوێنەکەدا دیارە، وە ناوێک هەڵبژێرە بۆ بەشە تازەکە بۆ نمونە LABEL = D، ئێستا گرنگترین بەش لە کارەکە بریتییە لەوە کەوا دەبینین لە وێنەکە CREATE AS دوو هەڵبژاردەی بۆ دانراوە، بەشی مەنتقی یاخود لاوەکی ( LOGICAL PARTITION ) وە بەشی سەرەکی یاخود بنچینە ( PRIMARY PARTITION )، ئێستا ئێمە دەبێت ئاگاداربین لەم کارەدا، ئەگەر ئێمە LOGICAL PARTITION هەڵبژێرین ئەوا ئەو بەشە تازەیەی کە ناومان لێنا بەشی ( D ) دەبێتە بەشێکی لاوەکی وە دەتوانین ناوەڕۆکەکەی ببینین لە کاتی چوونە ژوورەوەمان بۆ ناو ویندۆز، وە هارد دیسکەکە دابەش بووە بۆ C,D، پاشان OK دابگرە وە لەم پەنجەرەیە دەچیتە دەرەوە وە پاشان APPLY بکە، وە لەم کاتەدا کاری دابەش کردنەکە تەواو دەبێت، بەڵام لەکاتی هەڵبژاردنی PRIMARY PARTITION ئەوا ئەم بەشە دەبێتە بەشێکی سەرەکی وە ئەمە سوود مەندە بۆ ئەوەی سیستەمێکی تریش دابنێین کە سەربەخۆ بێت لە سیستەمەکەی تر.

سێیەم:- دانانی زیاتر لە سیستەمێک. (بۆ نمونە C= WINDOWS ME وە D= WINDOWS XP )

وەکو دەزانین چەندان بەرنامە هەیە بۆ دانانی سیستەمی زیاتر بەڵام زۆر بەیان هەموو سیستەمەکان لەسەر یەک بەش دائەنێت، بەڵام بەرنامەی PARTITION MAGIC جیاوازییەکی هەیە لەگەڵ بەرنامەکانی تر ئەویش ئەوەیە دەتوانی چەند سیستەمێک دابنێیت کە هەریەکەیان لەناو بەشێکی هارد بێت، وە گرنگیەکەی لەوەدا دیارە کە هەڵدەسی بە شاردنەوەی (HIDDEN ) سیستەمی کار پێنەکراو لەکاتی بەکارهێنانی سیستەمێکی تر (ACTIVE ) .

وە لەکارە باشەکانی ئەم ڕێگایە :-

* هەر سیستەمێک سەربەخۆیە لە سیستەمێکی تر، گریمان ئەگەر سیستەمی WINDOWS ME تووشی ڤایرۆسێک یان کێشەیەک بێت ئەوا سیستەمەکەی تر WINDOWS XP تووشی هیچ شتێک نابێت .

* هەندێک لە بەکارهێنەرانی ئینتەرنێت دوو ئامێریان هەیە،ئامێرێک بۆ بەکارهێنانی

ئینتەرنێت وە ئامێرێکی تر بۆ بەکارهێنانی کاروباری تر، بەڵام بەهۆی بوونی دوو سیستەم لەPARTITION MAGIC دەتوانین سیستەمێک بۆ بەکارهێنانی ئینتەرنێت بێت وە سیستەمەکەی تر بۆ بەکارهێنانی تر بێت .

پاش بەشکردنی هارد دیسک بۆ دوو بەش ( C,D)، لەوێنەی چوارەم کە نوسراوە CREATE AS دەست دەکەین بە هەڵبژاردنی PRIMARY PARTITION وە OK دەکەین، تێبینی دەکەین (وێنەی ژمارە-٥) هارد دیسک دابەش بووە بە دوو بەش، بەشی(C ) چالاک (= STATUS ACTIVE)، وە بەشی D بزربوو ( -STATUS HIDDEN)، وە بۆ ئەوەی بتوانین دوو سیستەمان هەبێت ئەوا دەبێت هەردوو بەشەکە بکەین بە PRIMARY PARTITION، پاش ئەمە بە کلیکی ڕاستی ماوس لەسەر بەشی D فەرمانی FORMAT هەڵبژێرە، پاش فۆرمات کردن برۆ بۆ ADVANCED پاشان SET ACTIVE وە دوایی OK بکە، پاش بەکارهێنانی ئەم کردارانە ئەوا بەرنامەکە هەڵدەستێ بە ئەکردار کردنی بەشی D وە شاردنەوەی بەشی C وە داوای RESTART دەکات، دوای ئەمە دەست بکە بە دابەزینی ویندۆز XP بۆ سەر بەشی D .

پرسیار / چۆن ئەتوانین سیستەمەکان بگۆڕین؟

وەڵام / ئەتوانین سیستەمەکان بگۆڕین بە بوونی دوو ڕێگا :-

یەکەم / لەڕێگای سیستەمی ویندۆز، هەڵسە بە دابەزاندنی بەرنامەی PARTITION MAGIC لەسەر هەردوو سیستەمەکە، وە ئەم کارە بکە لەناو بەرنامەکە، برۆ بۆ ADVANCED دوایی SET ACTIVE پاشان OK بکە .

دووەم / لە ڕێگای سیستەمی دۆس، پاش ئیش پێکردنی ئامێری کۆمپیوتەر دیسکی RESCUE DISKETTE CREATE دەخەینە نێو درایڤەری فلۆپی وە دەست دەکات بە کردنەوەی بەرنامەی PARTITION MAGIC لە ناو دۆس وە لە ڕێگایەوە دەتوانین کامە سیستەممان بویت هەڵبژێرین.




وێنەی (٣)




وێنەی (٤)




وێنەی (٥)

# چۆنیەتی خێراکردنی بەرنامەکانی کۆمپیوتەر


بێستون عمر حسن





وینەی ژمارە (١)

سیستەمی ویندۆز بەم هەموو تایبەتمەندیەی کە هەیەتی بەهەموو ئەو ڤێرژنانەش کەدەرچون پڕن لە نهێنی جۆراوجۆر یان لە ئەنجامی مومارەسەیەکی زۆر لەسەر کۆمپیوتەر یان لە ئەنجامی گەڕان و دەسکەوتنی زانیاری دەگەین پێیان یائەوتا لە ڕێگای بە شی هاوکاری کردن لە ناو خودی سیستەمەکە دەتوانین بگەین بەم نهێنینەی سیستەمەکە، بێگومان ئەم کردارانە ون و شاراوانەی ناو سیستەمەکەش سودیان بۆ بەکارهێنەرانی کۆمپیوتەر دەبێت، سیستەمی ویندۆز ئەگەر تائێستا ئالۆزترین سیستەم بێت سەبارەت بە ئێمە ئەوا لەسەر تانسەری جیهان زۆرترین بەکارهێنەری هەیەو تاکو ئێستاش ٩٠٪ ی کۆمپیوتەرەکانی جیهانی داگیردوە . خێراکردنی ئەو بەرنامانەی کە ڕۆژانە بەشێوەیەکی زۆر دەکرێنەوە بەکاریان دەهێنیت زۆر گرنگە، چونکە لەم ڕۆژگارەدا کات زۆر پێویست و لەم خێرایی کارکردنەدا کات بەشی پڕکردنەوەی کارەکانمان ناکات بۆیە دەبینین هەندێ لە بەرنامەکانی

کومپیوتەر بە هێواشـــی دەبنەوە ئەمەش وا لــە بەکارهێنەر دەکات کە کاتێکی زۆر بە دیار کۆمپیوتەرەوە بباتە سەر نمونەی ئەم بەرنامانەش فۆتۆ شۆپ و بەرنامەی خوێندنــەوەی کتێبــە ئەلیکترۆنیــەکان و بەرنامــەی میدیا ســتۆدیۆو هتد، بۆ ئەم مەبەســتە بە ڕێگایەکی زۆر ئاســان ئەو بەرنامانەی کە پێویســتن بە خێرایی کار بکەن خێرایــان دەکەین . بــۆ زانیاریتان ئــەم هەنگاوە نیــوەی کاتــی کردنەوەی بەرنامــەکان دەگەڕێنیتــەوەو خێرایــی کارکردن و بەجێگەیاندنی ئەو فەرمانانەی پێدەدرێن بە بەرنامەکان .

لە سەرەتادا ئەو بەرنامەی کە دەمانەوێ خێــرای بکەیــن دەیکەینەوە، بــۆ ئەوەی لەنــاو WINDOWS TASK MANAGER دەرکەوێــت، ئینجــا لە ســەر کیبۆردەکە پەنجــە بنــێ بــە CTRL + ALT + DELET ڕاســتەوخۆ دەچێتــە ســەر WINDOWS TASK MANAGER بڕوانــە وێنەی ژمارە (١) . دوایی دەچینە ســەر PROCESSES لەوێــش نــاوی بەرنامەکــە دەبینیەوە و کلیکی ڕاســتی لە سەر دەکەین و دەچینە ســەر SET PRIORITY بڕوانە وێنەی (٢) دەبینین چەند هەلبژاردەیەکی تێدایە بەپێی پێویستی خۆمان دانەیەکیان هەڵدەبژێرین بۆ خێراکردن ئەوانەی سەروی NORMAL هەڵدەژێرین ..




وێنەی ژمارە (٢)



# بیل گیتس مۆبایلێکی نوێ دەخاتە ڕوو

**ئا: کاروان سەعید**

لەم دواییەدا گەورە ملیاردێری جیهانی و خاوەنی کۆمپانیای مایکرۆسۆفت (بیل گیتس) مۆبایلێکی نوێی بەناوی (TREO) خستە ڕوو کە کۆمپانیاکەی توانیویەتی پێشی بخات بە هەماهەنگی لەگەڵ کۆمپانیای (PALMINK)، ئەم مۆبایلە کە پشت بە سیستەمی (WINDOWS MOBILE 5.0) دەبەستێت توانای تێکەڵکردنی فەرمانە ئاساییەکانی مۆبایل و ژمارەیەک فەرمانی کۆمپیوتەری وەکو زانیاری دارایی و بەرنامەی چارەسەر کردنی دەقەکانی هەیە سەرەڕای بەجێگەیاندنی خزمەتگوزاری پۆستی ئەلیکترۆنی و کردنەوەی ماڵپەڕەکانی ئەنتەرنێت، وابڕیارە مۆبایلەکە لەسەرەتای ساڵی ٢٠٠٦ ز بکەوێتە بازاڕەکان و کۆمپانیای (فرا یزون) ئەرکی فرۆشتنی مۆبایلەکە لە ئەستۆ بگرێ کە چاوەڕوان دەکرێت پێشوازییەکی بەرچاوی لەلایەن بەکارهێنەرانی لێ بکرێت.

سەرچاوە : شبكة المحيط

## ئاگاداری

داوا لە هەموو ئەو خوێنەرە بەڕێزانە دەکەین کە هەر پێشنیارێک یان هەر تێبینێک یان هەر ڕەخنەیێکیان هەبوو یان هەر کەم و کوڕێکیان لە گۆڤارەکە بە دی کرد با ئاگادارمان بکاتەوە بەم ناونیشانە : هەرێمی کوردستانی عێراق / یەکەی کۆمپیوتەر لە دیوانی وەزارەتی رۆشنبیری لە هەولێر جادەی شەست مەتری نزیک هۆڵی زەرد ژمارە تەلەفۆنی ٢٢٣٢٧٢١ مۆبایل ٠٧٥٠٤٦١٨٠٤٥ یان پۆستی ئەلکترۆنی.

Email : computer_magazine_2005@yahoo.com

Email : aras_co_center@yahoo.com

Email : aras_aaa@hotmail.com

# لابردنی چاوە سورەکان لە وێنەکەتدا

ئامادەکردنی:
بەفرین عبدالله رشید*



وێنەی (١)

جاری وا هەیە دەبینین کە ڕەسمێکی زۆر جوانت هەیە خراپ بووە بەوەی چاوی کەسێک سوور دەرکەوتووە. (ئەدۆب فۆتۆشۆپ) ڕێگەیەکی زۆر ئاسانت ئەداتێ بۆ چارەسەرکردنی ئەو چاو ەسووورە بە بەکارهێنانی ئایکۆن یان بڵێین ئەداتی وەک (REPLACEMENT TOOL- أداه بديل اللون) تۆی خوێنەری گۆڤاری کۆمپیوتەرلەم وانەیەماندا فێر ئەبیت چۆن چارەسەری چاوەسورەکان بکەیت تەنها بەم چەند هەنگاوەی خوارەوە:

بڕوانە وێنەی (١)

## ١. ڕەسمەکەت بکەرەوە:

لە ناو بەرنامەی (ئەدۆب فۆتۆشۆپ)دا ئەو ڕەسمەت بکەرەوە کە ئەتەوێ چاکی بکەیت، لە (TOOL BOX)ەکدا قەبارەکەی لە ڕێگەی ئایکۆنی (ZOOMING TOOL) ئەوەندە گەورە بکە کە بتوانیت بە ئاسانی سورایی چاوەکە ببینیت، دواترکلیک بکە لە (REPLACEMENT TOOL) کە لە (TOOL BOX) ەکەدا هەیە سێ بەشی هەیە ئەوانیش بریتین لە (HEALING BRUSHING TOOL - واقعه فی صندوق العدة بالفرشاة المشفية) و (PATCH TOOL – يرقع أداة). دوای ئەم دوانە سێیەم دانە هەڵبژێرە کە ناوی (COLOR REPLACEMENT TOOL)ـە کە هێمای چاوێک و فلچەیەکە.

بڕوانە وێنەی (٢)

## ٢.(Brush Tip- رأس فرشاة )هەڵبژێرە.

دوای خاڵی (١) ئیتر لە شریت (BAR)ەکانی لای سەرەوەدا شریتێکی تازە دروست ئەبێت کە (BRUSH TIP _ رأس فرشاة) ی تێدایە هەڵیبژێرە، ئەبینی مۆشرەکەت (شێوەی بازنەیەک و زائدێکی + لەناودایە) دروست بووە پێویستە قەبارەی ئەو بازنەیە بچوکتربێت لەو شوێنەی کە سورەو ئەتەوێت بیگۆڕیت.

(BRUSH TIP) چەندین قەبارەی هەیە پێویستە کەمترین قەبارە هەڵبژێریت، نرخی پابت لە دەوروبەری ٪ ٣٠ دایە .

بڕوانە وێنەی (٣)

## ٣. ڕەنگێک هەڵبژێرە بۆ ئاڵوگۆڕ کردنی بە ڕەنگە سورەکە .

بۆ نمونە، ڕەش ڕەنگێکی باشە بۆ هەڵبژاردن، بەڵام تۆ ئەتوانی هەوڵبدەیت ڕەنگێکی تر هەڵبژێریت کە لەو چاوە بچێت کە تۆ ئەتەوێت چاکسازی تیا بکەیت . بۆ هەڵبژاردنی ڕەنگێک، کلیک بکە لەو دوو چوارگۆشەیەی کە لە بۆکسی ئەدەواتەکاندا هەیە کە هەر چوارگۆشەی ڕەنگێکە، لە هەر یەکەیان ئەگەر ماوسەکە نزیک بکەیتەوە لە چوارگۆشەکەی سەرەوەیاندا دەنوسرێت (SET FOREGROUND COLOR) کلیکی لەسەر بکە پەنجەرەیەک دێتە بەردەست کە لە سەرەوەی نوسراوە (COLOR PICKER) ئەم پەنجەرەیە بە ماوسەکە هەڵگرەو بیخەرە لایەکەوە کە بەردەم چاوە سورەکەت لێنەگرێت پاشان ماوسەکەت شێوەی (EYE DROPPER TOOL)وەردەگرێت لە شوێنێکی گونجاوی چاوەکە کلیکێک بکە ورەنگێک هەڵبژێرە




وێنەی (٢)




وێنەی (٣)



وێنەی (٤)

کە نزیکە لەو ڕەنگەی پێویستت پێیەتی بۆ ئەوەی بیگۆڕیتەوە بە ڕەنگە سورەکە. پاشان لەو پەنجەرە کراوەدا کلیک بکە لە (OK) .

**٤. ڕەسمەکەت چاک بکەرەوە.**

ئێستا ماوسەکەت کرداری بۆیاخ کردن بەجێ ئەهێنێ، کلیکێک بکە و پاشان ئەو ڕەنگە ڕاکێشە بەسەر هەموو شوێنە سورەکاندا کە هەڵتبژاردوە .

**٥. ڕەسمەکەت بچوک بکەرەوە.**

ئەتوانی بەهۆی (ZOOMING TOOL)وە قەبارەی ڕەسمەکەت بچووک بکەیتەوە بۆ بارە ئاساییەکەی خۆی.

ئێستا تۆ دڵخۆشیت بەو چاککردنە، وێنەکەت خەزن بکەو هەڵیگرە. جارێکی تر چاوی سوور نابێت بە کێشەت !

بڕوانە وێنەی (٤)

تێبینی/ سودم لە سایتی IMAGE READY& WWW.ADOBEME.COM_PHOTOSHOP وەرگرتووە.

*زانکۆی سلێمانی /ئامارو کۆمپیوتەر
bafreen_22@yahoo.com



# چی دەزانیت دەربارەی گرنگی outlook

تەها قادر حسێن
tahaqader@yahoo.com

یەکێک لەداهێنراوە بەسودەکانی کۆمپانیای MICROSOFT بەرنامەی OUTLOOK ە، کەتایبەتە بە ئیشکردن لە ناو نامەی ئەلیکترۆنی ڕێکخەری کارەکان وژووانەکان وڕێکخەرو راپەڕێنەری ناونیشانەکان و ژمارەی تەلەفونەکان. بەرنامەی OUTLOOK چونە ناو زیاتر بەشێکی ئەلیکترۆنیت پێشکەش دەکات لەناو زیاتر لەشوێنێک لە ئینتەرنێتدا، بەڵی تۆ دەتوانیت ئەم ئیشە بکەی لەبەرنامەکانی تری وەک بەرنامەی (WORD EXCEL) بەلام لەم بەرنامەی ئیستادا مرۆڤ دەتوانیت ڕێکخستنی زیاتری دەست بکەوێت، وەدەتوانیت ئەونامەیە هەلبژێری کە دەتەوێت بەشیوەیەکی نامە جوابی بدەیتەوە نەک بەشێوەی حسابێک (ژمیریارێک)،وە ئەتوانیت نامە بنوسی لەرێگەی بەرنامەیWORDMAILدەوە کەتواناکانی ئەم بەرنامەیە هیچ کەمتر نیە لەبەرنامەی WORD وەلەهەمان کاتدا تایبەتمەندییەتی نوسینی نامەیەکی ئەلیکترۆنی تێدایە، وەهەمان ئەو جاکارییانە دەگرێتە خۆکەلە WORD XP داکراوە، وەک تایبەتمەندییەتی بەکارهێنانی کارتی زیرەکی SMARTAGE وەک ڕاستکردنەی ئوتوماتیکی ومێژوو.

لەو داهێنانە ڕاستە جوانانەی کە لەم بەرنامەداکراوە تایبەتمەندییەتی لابردنی هەموو ئەو تەنسیقە نوسراوانەی ناو نامەی ئەلیکترۆنی دەگرێتەوە بە شیوەیەکی ئۆتوماتیکی واتا نەهێشتنی ئالۆزی لەو نامانەدا، کەوات لێدەکات بۆ رزگابوون ولابردنی ئەوهێلە جیاکراوانە لەنامەکەدا کەوا لەنامە دەکات کەبەئاسانی نەخوێنرێنەوەدو توانای بەکارهێنانی ناونیشان و سایتەکان ئەنتەرنێت دەبیتە پانتایی بابەتەکە، واتا دەتوانی بگەیتە شوێنی مەبەست بەبێ پێویست بوون بەکرداری COPY AND PAST.

تێگەیشتن لەخشتەی کاتەکان گۆرانی بەسەردا هاتووە SCHEDULING وەک تایبەتمەندی خەزن کردنی رۆژەکان کە پەیوەندی بەهەندێک بابەتەوە هەیە وەهەروەها بەشداری کردن لە زانیاری سەربەخۆدا BUSY یان ئازاد دا FREE لەرێگەی ئەنتەرنێتەوە.

وە لەناو ئەم بەرنامەدا پەنچەرەیەک هەیە هەموو مەوعیدەکان وئەو ئیشانەی کەپێت وتووە پێشتر کەپێویستە لەداهاتودا بیکەی بیرت دێنێتەوە.

بەدلتەنگییەکی زۆرەوە هەموو ئەم ئیشانە گەلێک کەمترە لەئیشەکانی کە لەبەرنامەکانی تردا هەن وەک لەبەرنامەی LOTUS ORGANIZE داهەییە.

ئەگەرتو OUTLOOK بەکاردینی لە گەڵ بەرنا مەی MICROSOFT EXCHANGE وەک ئەوەی کە کومپانیا بازرگانییەکان لە رۆژهەلات ورۆژئاوادا دە یکەن دەتوانی ئەمە بکەی، وە پی خۆشحاڵ دەبی کاتی دەبینی ئیشەکان ئاسانترن لەم بەرنامەدا وەک لەوانی تردا.

لەهەمان کاتدا تۆ دەتوانی ئەو ئیشە هەڵبژێری کە دەتەوێ بیکەی بەبێ پەیوەندی کردن بە ئینتەرنێتەوە OFFLING

وەبەردەوام بون لە تازە کردنەوەی پرۆتۆکۆلەکان وەک پرۆتۆکۆلی IMAGE POP MAPI... وەتایبەتمەندییەکی تری OUTLOOK داواکردنی ئەم بەرنامەیە بۆ پەیوەندی کردن بە خزمەتگوزاری نامەی ئەلیکترۆنی SERVER EXCHANGE "لەکاتی جیاکردنەوەی پەیوەندی تۆری هیلەکان، واتە توانای دەبی بۆ دورخستنەوەی ئەو نامانەی کە دەڵی خزمەت گوزار نییە.

ئەم بەرنامەیە بێگومان لەهێرشی هاکەرزەکان بەدوور نەبووە بەڵکو زیاتر فایرۆساوی دەبێت چونکە بەرنامەکە پەیوەندی بە ئینتەرنێت وحسابەوە هەیە (ئابووری)، بەلام ئەم داهێنراوە تایبەتمەندییەتی تێدایە کە هەلی دوور کەوتنەوە لە توشبوون بەفایرۆس دەکات وەئەمەش ئارادەیەک تایبەتمەندییەکی بەهێزە، بەلام تو ناتووانی هاوەلەکانی نامە ئەلیکترۆنییەکە کە هەیە لەنێوان فایلە جیبەجێکراوی فایلە رەسمییەکاندا جیا بکەیتەوە لەهەمان کاتدا ئەگەر ئەم تایبەتمەندیەت بەدڵ نەبوو دەتوانیت لەرێگەی بەڕێوبەری خزمەتگوزارییەوە EXCHANGE ئەم تایبەتمەندیە رێگە چارەیەکی دیکە دەست بخەی هەتاکو تۆ لەناو EXCHANGE دا ئیش بکەی، بەلام گەر لە EXCHANGE ئیش نەکەی ئەوا رێگە چارەی ئەم حاڵەتە CONDITION بریتییە لە هەستان بەگۆرینی مەلەفی تۆمارکردنی ویندۆز WINDOWS REGISTORY کە ئەمەش کارێکی گرانە.

Microsoft Outlook

ملف تحرير عرض المفضلة أدوات تعليمات

اكتب سؤالاً للتعليمات

بحث

Microsoft®
Outlook®

Microsoft Office XP

هذا المنتج مرخص لـ :

Your User Name
Your Organization Name
١٧٥٥٦-٠٠٠٠٠٢٥-٦٤٠-٥٤٢٨٥

Copyright © Microsoft Corporation 1995-2001.
كافة الحقوق محفوظة. هذا البرنامج محمي بموجب القوانين الأميركية والدولية لحقوق النشر كما هو مبين في تعليمات/حول.

# یارییەکانی کۆمپیوتەر و مەشقی سەربازی



نووسینی: هاژە سعید یحیی

لە سەرەتادا یارییەکانی ڤیدیۆ و کۆمپیوتەر بۆ مەبەستی یاریکردن دروست کران، بەڵام لەگەڵ ئەو گۆڕانکارییە مەزنانەی کە بەسەر تەکنۆلۆژیای ئەو یارییانەدا هات و توانای مامەڵکردنی لەگەڵ ڕاستیدا هەبوو بۆیە ڕێگایەکی نوێی گرتەبەر تا وای لێهات بۆ مەبەستی مەشقی سەربازی بەکار بێت.

### مێژووی یاریەکانی کۆمپیوتەر و ڤیدیۆ:

١. لە ساڵی ١٩٥٢، ئا.س.دۆگلاس هێلکاری یەکەم یاری کۆمپیوتەری کێشا کە یاری (TIC-TAC-TOE) بوو.

٢. لە ساڵی ١٩٥٨، ویلیام هیگینبۆتام و یاریدەدەرەکەی لە تاقیگەی (بروکنهاڤن)ی نیشتمانی سەر بە وەزارەتی ووزەی ئەمریکی یەکەم یاری ڤیدیۆی دروست کرد کە ناوی (یاری تێنس بۆ دوو یاریزان - TENNIS FOR TWO) بوو.

٣. لە ساڵی ١٩٦٢، ستیڤ روسێل یاری (SPACE WAR) ی دروست کرد کە ئەویش یەکەم یاری بوو کە بۆ کۆمپیوتەر بەکار هات.

٤. لە ساڵی ١٩٦٧، رالف بییر، دەربارەی یەکەم یاری ڤیدیۆی نووسی کە لەڕێگای تەلەفزیۆنەوە بەکار بێت و ئەو یارییە ناوی (CHASE) بوو.

٥. لە ساڵی ١٩٧١، نۆلان بوشنێل لەگەڵ تید دیبنی، یارییەکی نوێیان دروست کرد کە لەسەر بیرۆکەی یاری (SPACE WAR)ی روسێل بوو، پاشان بوشنێل لەگەڵ تید بینی یاری (ئەتاری)ی کۆمپیوتەری دروست کرد لە ساڵی ١٩٧٢.

٦. لە ساڵی ١٩٧٢، یەکەم ئامێری ڤیدیۆی بازرگانی دروست کرا بە ناوی (ئۆویسی) کە ماگناڤۆچ بیرۆکەکەی داناو رالف بایر نەخشەسازی بۆ کرد. ئامێرەکە ١٢ یاری تێدابوو.

٧. لە ساڵی ١٩٧٦، فارچید یەکەم ئامێری پرۆگرام کراوی دروست کرد بە ناوی ڤارچید دوای ناوی گۆڕا بۆ CHANNEL F.

٨. لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٨١، هەردوو یاری (ASTEROIDS" AND "LUNAR LANDER) دروست کران کە ئەم دوویارییە بە شێوەیەی ڕەسمی بڵاوکرانەوە.

### بەکارهێنای یاری کۆمپیوتەر بۆ مەشقی سەربازی:

بەکارهێنانی تەکنۆلۆژیای یارییەکانی کۆمپیوتەر بۆ مەبەستی سەربازی لە ساڵی ١٩٩٩ دەستی پێکرد کاتێک پنتاگۆن بڕیاری دا بە دامەزراندنی پەیمانگای تەکنۆلۆژیا لە ویلایەتی کالیفۆرنیا بە هاوکاری زانکۆی باشووری کالیفۆرنیا، و ئەم پەیمانگایە دامەزرا لە ژێر ڕۆشنایی توێژینەوەی ئەو کۆنفرانسەی کە لە ساڵی ١٩٩٦ بەسترا بە نوێنەرایەتی کۆلێژی هێزی دەریایی و کۆمپانیای دیزنی و کۆمپانیای توێژینەوەی پێشکەوتوو (دارپا)ی پنتاگۆن و کۆمپانیای ئینتلی کۆمپیوتەر و کۆمپانیای پاراماونتی تەلەڤزیۆنی بەشداربوون و مەبەستیش لەم کۆنفرانسە نەخشەدانان بوو بۆ تەکنۆلۆژیای کۆمپیوتەرو ئەلیکترۆنی و باشترکردنی توانای سەربازەکان بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ بارودۆخ و تەکتیکی ناو جەنگ، بە شێوەیەک کە پەرە بە شێوازەکانی مەشقی سەربازی بدرێت، هەروەها کەمکردنەوەی ئەم برە پارە زۆرانەی کە بەکاردەهێنرێت بۆ مەشق کردنی سەربازان بە شێوەی واقیعی. بۆ نموونە دروست کردنی مووشەکێک بڕی

١٠ هەزار دۆلاری ئەمریکی تێدەچێت، و ئەو مەشقەی کە وەزارەتی بەرگری ئەمریکا لە ساڵی ٢٠٠٢ بۆ ١٤ هەزار سەرباز ئەنجامیدا لە ماوەی ٣ هەفتە، گەیشتە ٢٥٠ ملیۆن دۆلار، و کۆی گشتی پارەی سەرف کراو بۆ مەشقی سەربازی لە ئەمریکا ساڵانە دەگاتە ٥,٨ ملیار دۆلار.

لە ساڵی ٢٠٠٢ سەنتەری توێژینەوەی (RAND) راپۆرتێکی بڵاو کردەوە و تیایدا هاتبوو کە چینی ناوەڕاست لە هێزی سەربازی هەندێک گیروگرفتیان هەیە لەگەڵ چۆنیەتی مامەڵە کردنیان بە شێوازی تەکنیکی چونکە ئەوانە لە واقیعدا بەشداری شەڕیان نەکردووەو لەژێر رۆشنایی ئەم راپۆرتە سەنتەری (فۆرت سیل) لەسەر رووبەری ١٤٥ میلی دووجا لە شاری (لوتن)ی ویلایەتی ئۆکلاهاما دامەزرا بۆ مەشقی سەربازی و بەکارهێنانی شێوازی یارمەتیدەر بۆ بڕیاردانی تەکنیکی، ئەم پەیمانگایە شێوازی نوێی دۆزیەوە بۆ مەشقی سەربازی، مەشقی سەربازی بە شێوەیەکی رۆتینی پشتی بەستووە بەوەی کە سەرباز دەبێت چاوەڕێی دوژمنان بکات دەست بکەن بە تەقەکردن ئینجا ئەو دەست پێبکات. بەلام نموونەی شێوازی نوێ پشتی بەوە بەستووە کە شەڕکردن تەنها تەقەکردن نییە بەڵکو شەڕی ئێستا لەناو شارو لە نێوان خەڵکی سیڤیل روو دەدات هەندێکیان هاو پەیمانن، بۆیە سەرباز دەبێت بە شێوازی نوێ مامەڵە لەگەڵ ئەم بارو دۆخەدا بکات و ئەم یارییانە دروست کراون بە پشت بەستن بە چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەو سەربازانەی کە لە هێرشە سەربازیەکانی بوسنەو هێرسک و ئەفغانستان بەشدارییان کردووە. ویارییەکانی ئەو سەنتەرە لەسەر شێوازی هەرەمی سەربازی دروست نەکراووە کە سەرباز دەبێت بڕیار لەوەی سەرووی خۆی وەربگرێت بەڵکو وا دروست کراووە کە سەرباز بە پێی بارودۆخی شەڕ بتوانێت بڕیار وەربگرێت و لە هەر کاتێکدا پێویستی بە یارمەتی فڕۆکەو مووشەک بێت بتوانێت داوا بکات.



یەکەم کۆمەڵە سەربازی مەشق پێکراوی سەنتەری (فۆرت سیل) لە مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی رابردوو بوو بۆ کۆمەڵێک ئەفسەری هەڵبژێردراوی هێزەکانی پیادەو مارینز و هێزی ئاسمانی- وەزارەتی بەرگری ئەمریکا.

بەلام پرسیار لێرە ئەوەیە ئایا ئەم جۆرە یارییانە هیچ ئەنجامی ئەرێی هەیە؟، وەلامەکەش (بەلی)یە، چونکە هەندێک توێژینەوەی ئەکادیمی دەریان خستووە کە ئەم یارییانە بوونەتە هۆی فێربوونی هەندێک شێوازی شەڕ کە بۆ ماوەیەکی زۆر لەلایەن سەربازانەوە دەمێنێتەوە وەکو پشکنین و چارەسەرکردنی برینەکانی سک و هەروەها هەلمەتی رزگارکردنی خەلک لە ناو تەلاری گر تێکەوتوو.

**دوارۆژی یارییە سەربازییەکان:**

ئێستاش هەندێک پسپۆڕان لە هێزی سەربازی ئەمریکی لە ئۆرلاندۆ لە ویلایەتی فلۆریدا خەریکی پەرەپێدانی یاری (ONE SAF)ن، و ئامانجیش لەمە مەشق پێکردنی سەربازان نییە بەڵکو ئامانجی لەمە زیاترە کە ئەم یارییە بەکاردێت بۆ هێزەکانی هێلی پێشەوە تاوەکو بتوانن سیناریۆی گونجاو دروست بکەن بۆ ئەو بارودۆخانەی کە دێنە پێشیان لە کاتی جەنگداو واچاوەڕوان دەکرێت کە پەرەپێدانی ئەم یارییە چەند ساڵێک بخایەنێت.

هەروەها کۆشکی سپی ئەمریکی خەریکی دروست کردنی یارییەکە کە تا ئێستا هیچ زانیارییە دەربارەی بڵاونەکراوەتەوە، ئامانجیش لەم یارییە راهێنان و مەشق پێکردنی عەمیلی تایبەتییەو ئەم یارییە هێلکاری ووردی هەموو ژوور و ژێرزەمین و شوێنە تایبەتییەکانی کۆشکی سپی تێدایە.

ولە پرۆژەیەکی توێژینەوەی تاقیگەکانی ساندیای نیشتمانی سەربازی ئەمریکی، یاریەکی مەشقی پەرەپێدا کە ئەم یارییە بۆ مەشق کردنە بۆ چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ رۆشنبیری خۆماڵی کە هەندێک جار هێزی سەربازی ئەمریکی تووشی دەبێت، و هەروەها پەیمانگای تەکنۆلۆژیای هێزی سەربازی ئەمریکی یارییەکی تری پەرەپێدا بەناوی یاری (AWE) وئەم یارییە کە هێزی ئەمریکی بەکاری دێنێت کۆمەڵێک سەرباز پێکەوە یارییەکە دەکەن لە رێگای ئینتەرنێتەوە بە بەکارهێنانی چەند کۆدێکی تایبەتی بە هێزی سەربازی ئەمریکی لەسەر ئینتەرنێت کە ئەوێش (MIL) بەرانبەر COM. ORG...هتد.